


بۆ فرۆشتن نیە

سالْنامەیەکی تایبەتە بە یادی ئەنفال | ژمارە(2) | 2005/5/3 (سالْی دووەم) | No: (2) 3/May /2005

## دۆزینەوەی گەورەترین گۆڕی بەکۆمەڵ لە سەماوە

رۆژی هەینی 2005/4/30 لەشاری سەماوەی باشوری عێراق گەورەترین گگۆڕی بەکۆمەڵ دۆزرایەوە کەپێشترو لەسەردەمی رژێمی بەعس بەکۆمەڵ گولەباران‌و بەکۆمەڵ زیندەبەچاڵکراون.

بەگوتەی لێکۆڵیارێکی ئەمریکی پسپۆر لەبواری پاشماوەکان تەرمەکان کوردن زۆربەشیان ژن‌و منداڵن‌و جل‌وبەرگی کوردەواریان لەبەربووەو لەرێی کاتژمێری دەستیان‌و هەندێ داودەرمانی ئەوسەردەمە کاتی قەتلوعامکردنیان زانراوە کەدەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1988و لەپرۆسەی ئەنفالدائەم تاوانە ئەنجامدراوە

# ئەنفال‌وجینۆسایدکردنی کورد

# تەنها بە پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ قەرەبو دەکرێتەوە


لەبیاباندا ونتان کردین، لەچیاکانەوە دێینەوە
تابلۆ: سامان قادر

## بۆئەومرۆڤانەی سەگەڕەشەکانی بیابان فریای خواردنیان نەکەوتن

هیوادارم ئەم دیاریەم لێ قەبوڵ بکەن‌وبەگەورەیی خۆتان لەکەم‌وکوڕیەکانم ببورن, پێمخۆش بوو لەبری ئەنفالستان رۆژنامەیەکم بۆبکردنایە بەدیاری بەئەنفال نامۆبوایە, بەڵام چیبکەین ئێوە بوونە ئەنفالکراوو هەندێك بوونە ئەنفالچی ومنیش کۆکەرەوەی خەمەکانتان, دڵنیابن لەوقەڵەم فرۆشانە نابم کەلەیادی ئەنفالکراوەکاندا خەریکی قسەی زل‌ودزیوو فزی‌وپێکهەڵدانن, ئامادەم لەپێناوی دوارۆژی مرۆڤایەتیدا, ئەنفالچیەکان‌وبەعسیە ریسواکانی بەردەمی مێژوو خوێنم بکەن بەپێکی خۆیان, بەڵام نابێت, پێکی رووزەردی لەسەرئێسك‌وپرووسکی ئەنفالەکان بخۆمەوە, چیبکەم خۆچەرخی رۆژگار بەدەستی من ناسوڕێ هەتا وای‌بسوڕێنم هەموو ئازارەکانتان لەبیر بەرمەوە, دەسەڵاتم بەدەست نیە هەتا ئێوە لەدەسکەنەی نۆك‌وگوڵەوەچنی رزگاربکەم, یاسا بەدەست من نیە هەتا لەپێش هەموکەسێکەوە ئێوە خانەنشین بکەم‌وقەرەبووی ئەوهەموو قەهروتاڵاوەتان بۆبکەمەوەوهەموتاوانبارانیش ڕاکێشمە بەردەمی دادگاکان‌و ئەوپرسیارانەیان ڕووبەڕووبکەمەوە کە حەڤدە ساڵە گرێیەکی گەورەن لەسەردڵمان, تاپێمان بڵێن ئەوعەشاماتەیان چۆن گرت؟ کەگرتیانن چیان لێکردن؟بۆ کوشتیانن چۆن کوشتیانن؟ لەکوێ‌و چۆن دەستیان چووە ئەو تاوانە؟کەدەستیان تێچوو گۆڕەکانیان لەکوێیە؟ خۆ هیچم بەدەست نیە, هەتا هەموو ئەو ڤیەللاوکۆشك‌و باڵەخانانەی بەبەتاوان‌وخۆفرۆشتن‌و خەڵك فرۆشتن بەرزیانکردووەتەوە, لێیان زەووتبکەم‌و بۆمنداڵەکانتانی بکەم بەمیوانخانەوکتێبخانەو مەڵبەندی رۆشنبیری‌وباخچەوشوێنی دڵداری کوڕوکچەکانتان, ئەگەر دەسەڵاتم دەبوو ئەو شۆفلانەی عەلی کیمیاوی خانووەکانی ئێوەی پێرووخاند منیش ئەو ووشکەکەڵەکانەم پێدەرووخاند کە بەعسیەکان بەزۆرەملێ بەئیوەی ڕەوا بینی‌وهەربۆ ئەتك, ناوی نابوون خانووی هاوچەرخ! ئەگەردەسەڵاتم دەبوو هەموو ئەنفالچییەکانم بەکورد وعەرەبەوە بانگەدەکردە بەردەم دادگاو, بەو پەڕی رێزەوە لێکۆڵینەوەم بۆ سازدەدان, تاسزای خۆیان وەردەگرن, بێئەوەی کەسیان بکوژرێن, کەسیان سووکایەتیان پێبکرێت, بێهەڵاواردن, بۆئەوەی بزانن ئێمە ئینسانین ئینسانیانەش دادگایی تاوانباران دەکەین, لەکەسیان نابوورین, بەڵام کەسیان بەو دەردەنابەین کە ئێمەبە بەدەستی ئەوان بەسەرمانهات, کەسیان لێ ئەنفال ناکەین وەك ئەوان ئەنفالیان کردین. بەڵام ئەوەی لێیان قەبوڵ ناکەین ئەوەیە نابێت چی تر ئاوا بەمشەخۆری‌ودواکەوتوویی‌بمێننەوەو وەچەبخەنەوە, دەبێت ئیدی بکرێن بەئێنسان.

**سەرنوسەر**

## تاوانبارەسەرەکیەکانی ئەنفال بناسە

- **تاوانباری گەورە سەدام حسێن** سەرۆك کۆماری عێراق‌و سەرۆکی کشتی هێزەچەکدارەکان .
- **عەلی حەسەن ئەلمەجید** دەسەڵاتداری یەکەمی ناوچەی باکوروجێبەجێکەری کردەی ئەنفال .
- **تاهرتوفیق عانی** سکرتێری لیژنەی کاروباری باکور بووە
- **فەریق سڵتان هاشم** سەرۆکی ئەرکان‌و پێشەوای فەیلەقی یەك‌وپێنج‌وجێبەجێکەری ئەنفالی یەك
- **ئەیاد خلیل زەکی** : پیشەوای‌هێزەچەکدارەکانی ئەنفالی دوو
- **بارق عبدولله حنتە** : پیشەوای هێزەچەکدارەکانی ئەنفالی‌سێ وچوار
- **نزارعبدالکریم خەزرەجی** پێشەوای هێزەچەکدارەکانی ئەنفالی 4و5وقەتڵ‌وعام کردنی گوندی عەسکەروگۆپتەپە.
- **عمید یونس ئەنساری( یونس محەمەدعلی** ) سەرلەشکری فەیلەقی 5 ی هەولێر بوو.
- **عمید خالد محمدعباس** فەرماندەی‌کەرتی ئیستخباراتی رۆژهەڵات بوو.
- **عمید فرحان ملك سالح** فەرماندەی کەرتی ئیستخباراتی خۆرئاوابوو.
- **عبدالرحمن عزیزحسین** بەرێوەبەری گشتی ئەمنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بوولەماوەی ئەنفالەکاندا .
- **رازی حەسەن سلمان** جێگری سکرتێری فەرماندەی مکتب رێکخستنی‌باکوری حزبی بەعس بوو.
- **عقید تاهرجلیل ئەالحبوش** سەرۆکی موخابەراتی گشتی‌وبەرپرسی نوسینگەی تایبەتی عەلی کیمیایی.
- **رائید نەزهەد توغان تکریتی** : بکوژی بەکۆمەڵی ئەنفالەکان لەگۆڕە بەکۆمەڵەکاندا, بەرپرسی پاسەوانەکانی عەلی کیمایی .
- **ملازم اول مەسعود عەزاوی**, بکوژی بەکۆمەڵی ئەنفالکراوەکان .
- **ملازم اول صائب تکریتی** بکوژی بەکۆمەڵی ئەنفالکراوەکان, کەدواتر علی کیمیاوی کردی بەعەقید .
- **ملازم اول حاتم ئەلئەنباری** بکوژی بەکۆمەلی ئەنفالکراوەکان.
- **تاوانبار حجاج** دڕەندەترین دووپێ لە گرتووخانەکانی نوگرەو سلمان.

## پرسیارێکی کورت بەڵام گرنگ

ئەگەر6ی کانوون رۆژێکی پرشنگدارە لەمێژووی عێراقدا, ئەی 4/14چیە؟ ئەمە پرسیارێکی گرنگە لە دەسەڵاتدارانی ئەمرۆی کوردستان‌وعێراق. پێویستە وەڵامی ئەوە بدنەوە بۆچی هەتا ئیستا رۆژی سوپای عێراق بەجەژن دەزانن‌و دەکرێتە پشووی ڕەسمی بەڵام رۆژی ئەنفالکردنی کوردیش بەرۆژێکی ئاسایی ؟ هەمووومان دەزانین 6کانوون رۆژی دامەزراندنی ئەو سوپایەیە کە گەورەترین تاوانی دەرهەق بەهاونیشتمانیانی خۆی ئەندجامداوە, جینۆسایدی‌کوردی کردوو بەهەزاران هاوڵاتی عێراقی کوشتووەیان بەکوشتنی داوە, تەنانەت پاش هەڵوەشانەوەشی هەریادی دەکرێتەوە؟! کە چی یادی ئەنفالەکان ؟ بەرۆژێکی ئاسایی وەردەگیرێ ؟!

# کیمیا بارانی گۆپتەپەو عەسکەر برینێکی سارێژ نەبوو بەجەستەی کوردەوە

# ئەوەی ئازاری ئەنفالی چەشتبێ، ئەوپیاوە چاوشینەی خۆش دەوێ

**ئەنفالستان**

ئەفسوس ئێمەلەکلتورێکدا دەژین, تیایداجەنگاوەرەکان لەعاشقەکان بەرێزترن , ئەوانەی ئەنفالیان کرد, سەروەر ترن لەوانەی ئەنفالکران, بەرەوشت گەلێکەوە شەتەکین, لەمێژە جوانی لەدەستداوە, رۆژنیە دەرزەنێک نەفرەت بۆ تاوانباران نەنێرین, کەچی کەی ئەوان مەزاجیان بوو, بانگمان دەکەن‌ومەجلیسی قسەی قۆرمان پێگەرم دەکەن! ئێمە ئەوکۆمەڵگا سەیرەین, هەموو رۆژانی هەینی دەچینە سەرگۆڕی مردووەکانمان, بەلام لەسەرکێشەیەکی زۆر گچکە ئامادەین ساڵێك ڕوو لەزیندووەکان وەرگێڕین, خراپترین مردوومان لە باشترین زیندووی هەژار پێباشترە, ئەمەبەدیوەکەی تریشدا هەروایە ترسنۆکترین‌و گەمژەترین بابای دەولەمەندمان لەئازاترین و رۆشنبیرترین کوڕە هەژارێك بەلاوە مەردترە! بەش بەحاڵی خۆم ئەمە بەغەدرێکی گەورە دەزانم هەربۆیە ساڵی ڕابووردوو ئەو پیاوانەم هێنایەوە بەردیدەی خوێنەران کە لەناوکورەی ئاگری ئەنفالدا گیانبازیانکردوو مەرگیان پێ باشتربوو لەڕووزەردی, لەپێناوی ئەوانی دی ژیانی خۆیان رەتکردەوەو ووتیان ئازادیمان بۆهەمووان دەوێت, باسی ئازایەتی شێخ حسێنی هەزارکانی‌و عەبدولای‌و خەرابەیی‌و کوڕەگەنجێکی گەرمیانیم بەناوی (جەمال) کردبوو, کەهەریەکەیان بەجۆرێك لەشالاوی ئەنفال دەرفەتی رزگاربوونیان بۆڕەخسابوو, بەلام ئەوان ئەوەیان ڕەتکردەوە بەتەنیا ئازاد بکرێن, ووتیان: ئەگەر ئازادیە با بۆ هەموومان بێت دەنا بۆ ئێمەش نا, تەنانەت شێخ حسینی هەزارکانی بڕیاری تایبەتی سەدامی بۆ ئازادبوونی خۆی‌وخێزانەکەی ڕەتکردەوە, وەلێ ئەمجارە قسەلەسەر شەهیدێکە هێشتا لەژیاندایە! باسی مرۆڤێکی زیندوو دەکەین لە ئێستاوە گیانی بەخشیوە! پالەوانی ئەمجارەی ئەنفالستان خەمخۆرێکی نەسرەوتی سۆراخی ئەنفالەکانە, (عبدواللەکریم محمود )ئەوپیاوەی‌ئەگەر لەم ولاتەدانەبوایە دەبوو خاوەنی باشترین خەلاتی مافی مرۆڤ بێت, نوسەری هەردووبەرگی کتێبی ڕەشەبای ژەهرو ئەنفال, ئەو پیاوە تێکۆشەرەی نیوەی تەمەنی پێشمەرگایەتی بردی‌وبەری ڕنج‌و تێکۆشانەکەشی کۆنە بەعسیەکان, ئەو پیاوە چاوشینەی لەپاش ڕاپەڕینەوە ئاو ڕاوەستابێت ئەم ڕاوەستانی نەزانیوە, هەمیشە بە خەمێکەوە دەردەکەوێ, ئەویش خەمی ئەنفالەکانە, خەمی کچی فرۆشراوو, کوڕی بێسەرووشوێنکراوو, پیرەمێردوو پیرە ژنەکەنەفتەکانی گەڕاوەی نوگرەو سەلمان, ئەو پیاوەی کەسی ئەنفالنەکراوەهەمیشە بەسۆراخیانەوەیە, ئەگەر یەکێك حاڵ‌وگوزەرانی نەزانیێ‌وکتێبەکانی ببینیێ, وای بۆدەچێت گەورەترین دەزگای ڕاگەیاندنی لەبەردەستدابێ, بەلام ئەفسوس, ئەوکاتانەی رۆژنامەنووسە مشەخۆرەکان لەبەر تەبریدی کەلەتەزێن بۆموکافەئە خەریکی ووتارنووسین وخواردنەوەی چای لیپتۆنن, ئەو, بە جووتێك پێلاوی لەنگەوە دیهاتەودیهاتی گەرمیان تەی دەکاو بەدەم نان خواردنی هەژارانەی دەستی داپیرە ئەنفالکراوەکانی ئۆردوگاکانی شۆڕش‌ورزگارییەوە گوێی لەحیکایەتی‌ئازارەکانی مام ڕشیدومیمکە خەجێ گرتووە, کەحەجاج چۆن زوو زوو لێیان هاربوەو وەك جانەوەر بەندیەکانی ئازارداوە, ئەورۆژانەی دام‌ودەزگاکانی رژێم تالان دەکران‌و بەرپرسەکان بەدوای جوانترین سەیارەی علوجدا هەلپەیانبوو, ئەوپیاوە چاوشینە بەونیازەی سەرە داوێك لەچارەنوسی ئەنفالکراوەکان بدۆزێتەوە بەدوای بەلگە نامەترسناکەکانی رژێمی بەغداوەبوو, من نەعبدوللا دەناسم‌ونەچایەکیشم لەگەڵ خواردووەتەوە, نەخزمەونەهاوڕێمە, ڕەنگە زیادە ڕۆیی نەبێت ئەگەر بلێم ئیستاش ناوم نازانێت, بەتەلەفۆن نەبێت پێم وانیە, چوار ڕستە قسەم لەگەلدا کردبێت, بەلام سەدان ڕستەی ئەو پیاوە کەهەمیشە خەمی ئەنفالەکانیان پۆشیوە, میوانی بیرو ئەندیشەمن, کتێبەکانی هاوڕێی شەوانە من, پێکەوە دەچینە سەر گۆڕە بەکۆمەلەکان, دێڕەکانی چاوساغیم دەکەن‌و دەمبەنە شوینی گیراوەکان, دەمبەنە مالی پیرە ژن‌وپیرە پیاوەکان, روخساری مندالە دلشکاوەئم پیشاندەدەن, دەیان جار ووشەکانی ئەو پیاوە سورە چاوشینە پیم دەلێن : ئاگاداری ئینسانیەتی خۆتبە, ئەم هەموو مەرگەساتە بەرئەنجامی ئەوەیە ئەنفالچیەکان ئینسانیەتی خۆیان لەبیرکردبوو, من هەلەشەییەکەی نەبێت هەموو شتێکی ئەو پیاوەم پێجوانە, ئێخۆ کەسیش بێ کەم‌وکوڕی نیە, هەموومان پڕین لەجوانی‌و لە دزیووی بەلام عەبدوولا پڕە لەخەمی جوان,شەکەتە لەوپرسیارانەی وەلامێکی هاتنەوەی ئەنفالەکانی نادەنێ, ماندووە لە بینینی روخسارە ماسکدارەکان, وەلێ ئەمە ڕاستیەکەیەتی‌وخۆی نایەوێت ڕاستیەکەی بلێێ. هەن دەلێن بابەتەکانی ئەوپیاوە زانستی نین, من کاری زانستی‌ونوسینی بەمیتۆد ڕت ناکەمەوە بەلام ئەوەم لەپێش چاوە کە دکتۆروپرۆفیسۆروفەیلەسوف گەلێکی زۆر هەن مینگەمینگی ئەوەدەکەن پاساو بۆ تیرۆرستان دەهێننەوەوهەشبوون لەم بابەتانە لەگەرمەی ئەنفالی کوردان‌ولەپاش روخانیشی شەرم نەکەن لەوەی بەگەوجێکی وەك‌وسەدام بلێن ئازا تێگەیشتوو, شتی قۆرتریش لەم دەستەواژانەی هەرگیز شایانی جانەوەرێکی دوویێی وەك سەدام نین.



## نامەیەك بۆ عەدەحەیاتم

# هونەرمەند (سەربەست ئەحمەد)ی هاوڕێم

**زەنوێر**

هاوڕێم ببورە کە ئەم نامەیە بێئیزنی تۆو هاوڕێ خوێندکارەکانت، بێئیزنی ئێسك وپرسکی ئەنفال کراوەکانمان، بێئیزنی خواوتەختی تژی لە تاوانی ئەوێ رۆژی گرگن و قەزەمە شمشێر بەدەستەکانی ئەم مەملەکەتی سقیلە، بێئیزنی تەلحەوعومر و دەحام و قەحتان و سەدام وعەلی، بێئیزنی ناخی هەمیشە گریاوی زەریف و شەمسەو ئامین وحەلاو وکەسران و کەژاڵ و ئەختەر و هەنارو ئەو بۆخچەیەی کە بۆ هەمیشە چاوەڕوانی ئەوەین (دیجلە)بۆمان بنێرێتەوە، بێئیزنی(بەهار)کە کەژاوەی یەکشەوەی بوکێنی نەترازان و پیاوەکانی‌دورگەی جەهل بردیان و تاهەنووکەش نەهاتۆتەوە، بێئیزنی هەموو ئەوانە و زۆرزۆری تریش، ببورە ئەم نامەیەت بۆ دەنوسم ،ئاخرمن هیچ نیم لە ئاست کۆشێك (ئەنفال) کە تۆو هاوڕێ خوێندکارەکانت ئەمساڵ جیاواز لە ڕێتم و سروتی‌کارکردنی ساڵانی رابوردوو، شتێکتان لە خەمی کۆستی ئەنفال بۆ گێڕاینەوە و هەمووانتان بەبێ جیاوازی گریان و ئێوە نیشتمانێکتان لە کۆستی ئەنفال بۆ کردین بە شانۆو لەرێی شانۆوە شەق و زلەیەکی پێویستان سرەواندە بناگوێی (17)ساڵ بێدەنگی. لەسەر تەختەی شانۆ ئێوە (تۆو هاوڕێکانت) حیکایەت خوانێکی ڕەوان بێژی تراژیدیای ئەنفال بوون, بەو هەناسانەی کە (17)ساڵە بۆنی دووکەڵ و باروت و ئازار و ناسۆری و هەلقرچان و سووتان و برسێتی و مەرگی چاوەڕوانی و لم و عەزرەتی تەنیا دیدارێك هەلدەمژن.

ببورە هاوڕێم ئێوە بوون لە 14/4/دا بوون بەدەنگی شکاندنی بێدەنگی و شەختەبەندانی ڕۆحی فریشتەیی کەسە دوورو بێسەرو شوێنکراوو کوژراوەکانمان،ئاخر ئێوە لە نێو بازنەیەکی بچوکی شانۆدا ،بەلام بەسەلیقەوە توانایەکی بەرزی هونەرییانە، هەموانتان هێنایە قسەو خستە بەردەم پرسیار.ئاخر (سەرە)گیان تۆو هاوڕێکانت ئەوپیرەژنە باوان و کەسو کار ئەنفال کراوەی کەیەك پیتی ناناسرێتەوە هێنایە قسەو بەدیار خۆت و کارکتەرەکانتەوە،بە تەماشایەکی پڕ حوزن و دوو چاوی پڕ لە فرمێسك ودنیایەك کەسەرەوە لەبەر خۆیەوە دەیوت (رۆلە ناوت نازانم رەبی شیری دایکت حەلالت بێ وا ئێمەت وەك خۆی لەبیرە).

### عەزیزم :سەربەست

لە رێگای تۆوە بەخۆت و هاوڕێ خوێندکارەکانت دەلێم جیاوازی لە نێوان ئێوە و ئەوانەی لە ئەنفال تێناگەن و منجەمنجیانە ،تەنهایەك شتە،ئەویش ئەوەیە تۆو هاوڕێکانت دەتانەوێ لە کۆستی ئەنفال بگەن وبیکەنە مەسەلەیەکی میلی،ئەوانی دەرەوەی بازنەی کارکرن و تێگەیشتنی ئێوە دەیانەوێ ئەنفال بکەنەئامرازی زیاترو زۆرترکردنی ئاپارتمان و پارە وپوولی ئێرە وئەوێ و گەرمترکردنی‌باری‌مالەکانیان .تۆبۆیەك لە حزش بێت ئەوانت گریان بەلام ئەز بەگومانم ئەو گریانەی ئەوان لە ناخەوە هاتبێ بەلکو ئەو گریانە هەنجەتی ڕاکردنیانە لەبەرامبەر ئەو پرسیارانەی دوای (17)ساڵ تۆو هاوڕێکانت لەرێی شانۆوە ئاراستەیانتان کرد. ئاخر ئەوان خۆشیان بە چارەی ئەم جۆرە پرسیارەی ئێوەو ماناندا لە رێگای شانۆوە نایەت کە ژنێك بە لە کۆستی ئەنفال پڕ کوڵە پشتی‌یەکانیان کردبێ لە نان و ئەمرۆش دوای (17)ساڵ چاوەڕوانی دەستی‌خێر و سوالیانلێ پان بکاتەوە .ئاخر ئەوان تاسەر ئێسقان دژی ئەوە دەجەنگن کە هونەرمەندان ئەو پیرەمێردە یان بێنێتەوە بەرچاوکەیێش کۆستی ئەنفال دیوخان و مالەکەی جێگەی پشوودان و درك پڕکردنی ئەوان بوو بەناوی شۆڕش و شۆڕش گێڕییەوە، کەچی ئەمرۆش لە پێناوی بەدەست هێنانی چەند قروشتی یەك ملیۆن جار لێیان دەپارێتەوە بۆ بۆیاخ کردنی پێلاوە گران بەهاکانیان.ئاخر ئەوان هەناسەی هەلقرچاوی بابایەکی لە ئەنفالبە جێماو نابینن /نا/ ئەوان بەر لە هەموو شتێ بۆ دەرکەوتنیان لە شاشەی T.V ی و چاوی کامێراکانەوە دێن. باشە هەر ئەوان نین بە سەفتە و ڕیز جنێوبۆ وێنەگرو مۆنتێرەکانی کەنالەکانی T.Vی دەنێرن تەنها لەبەرئەوەی لە ڕیزی پێشی پێشەوە دەریان نەخستوون؟ یاخود بەرێك و پێکی وێنەیان نەگرتوون، ئەی باشە هەرئەوان نین بەهەزار تکاوو پارانەوە تەشریف دێنن بۆ بینینی دیمەنێکی ڕاستەقینەی ئەنفال. باشە (سەرەی براو هاوڕێ)ئاخر من وام دانابوو کە وەزیری مافی مرۆڤ و ئاوارەو ئەنفال هەر هیچ نا دێتە حزووری (ئەم گوزارشتە هونەریەی ئێوە دوای (17) ساڵ چاوەڕوانی) ،نەمزانی‌بەرێزی زۆر لەوە سەرقالتر و گەورەترە بگاتە شوێنێك کەبۆنی دووکەڵ وئیغتسابکردنی کچانی کورد و سووتان و هەلقرچانی لێبێت.... ئاخر پێم وابوو سەرۆکی حکومەت دێت و دوای بینینی ئەم گوزارشتەی ئێوە لەکۆستی ئەنفال, پرچی دەیان و سەدان منالی بێ دایك وباوکی ئەنفال بەشانەی حوزن و لێبووردن وماچی تەهارەت دادێنیێ؟ نەمزانی بەرێزی بە نامەیەکیش بەشداریمان ناکا.(عەدە گیان) من و تۆ دەمانزانی حیزب گەلێك لەم شارو دەڤەری سووتان و هەلقرچانەدا تەنانەت ئامادەبوون چەن هەنگاوێك بە پێیان بڕن بۆ ڕێزلێنان لە (17)ساڵ چاوەڕوانی پرسوێی و ماندوو بوونی تۆو هاوڕێکانت. ئاخر بۆ نایەتەبیرت بۆ عەرزەوپارەو پاداشت وەرگرتن هێندزۆرن سامانی هەموو ولات بەشیان ناکات، بەلام بۆ گوێگرتن لە قسەکانی(لەتیف فاتح)لەسەرجاش و ئەنفال نایەن و تێی دەقوچێنن، من نەچووم بۆ کۆرەکەی (لەتیف) لەبەر ئەوەی دلنیابووم ئەو ئینسانە چەندین میل دەبرێ و دێت و دواتر بە هەناسە ساردی دەگەرێتەوە. من پێچەوانەی بۆ چوونی هەمووان نەچووم بۆلای (لەتیف)دەلیلی گریانم بوو بۆ (لەتیف)و ئەنفال.

### براو هاوڕێم :سەربەست گیان

هێندەم خەموقسە لە ناخدایە لە نامەیەکداجێی نابێتەوە، بەلام تکایە .. بە خوێندکارە رۆح سووکەکانت بلێ بائەوان بەردەوام بن... دلنیاش بن شانۆ دەتوانێ شووناسی نیشتمان و میلەتێك بەرز ڕاگرێ... من وەك خێزانێك کە لە ناو بۆن و دووکەلی ئەنفالا ژیاوم، گەورەیی ئەوان، سەلیقەی ئەوان، خەمی‌ئەوان بۆئەنفال لە بیرناکەم، دلنیام کەس وکاری ئەنفالکراوەکانی تریش هەمان هەستیان هەیە...

### بمبورە :حەیاتم

بێئیزنی ئێوەی هونەرمەند ئەم نامەیەم نووسی، هەست دەکەم لەبەردەم هەولی ئەمسالی تۆدا بۆ کۆستی ئەنفال بچوکم و هیچم پێ ناوترێ, ئەم نامەیەش هیچ نییە جگە لە ڕێزلێنانێك بۆ تۆ،ئەوەی لە دەستی منیش بێت تەنها نوسینە.. تەنها تکاشم ئەوەیە لە نیشتمانی بەرینی شانۆدا ئەو ئافرەتە سوالکەرەی پاشماوەی ئەنفال و ئەو پیرەپیاوە بۆیاخ چیەی دوای ئەنفال و ئەو تراکتۆرەخنکاوەی ناو ئەنفال و ئەو ،زۆر لەو(ئەو)انەی لە ئەنفالدا بوون بە شووناسی هەموان لەبیرمەکەن...

بوارم بدە کرنوش بۆ ماندوو بوونتان بەرم

فرمێسکی چاوی یەك بەیەکتان بۆ شکانی تینوێتی بخۆمەوە

# دێوێکی فەرامۆشکراوی کارەساتی ئەنفال

**ئاسۆ غەریب**

ئەنفال کارەساتێکی ئەوەندە نامرۆڤانە بوو کەخاوەنانی کۆن‌و نوێی ووشەی ئەنفال‌و داهێنەرانی کۆن‌و نوێی کردەوەی ئەنفالی لەبەردەم مرۆڤایەتیدا شەرمەزارکردووە. لەبەرامبەردا ئەنفال برینێکی ئەوەندە قولوبەسوێیە بۆ هەتاهەتایە لەجەستەی ئەم میللەتە سارێژ نابێت، بەتایبەتیش کە دەبینرێت دەسەلاتداران لە لابردنی ئاسەوارە کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌و دەروونیەکانی ئەو کارەساتە خەمساردن‌و لەئاستی ناوخۆدا وەك مەسەلەیەکی ئیعلامی‌و لەئاستی جیهانیشدا وەك ئامرازێك بۆ نیشاندانی مەزلومیەتی خۆیان بەکاری دەهێنن.

سەبارەت بەگەورەیی کارەساتەکەو، فراوانی بنکەی هەرەمی قوربانیەکان، سەبارەت بە هەلسوکەوتی درندانەی ئەنفالچیەکانو زۆرلایەنی دیکەی کارەساتی ئەنفال قسەی حیسابی زۆرو پڕمانا کراوە، ئەگەرچی نووسین‌و یاداشتەکان هەرچەندێك زۆر بن هێشتا لەپەراوێزی بالای بەرزی ئەو نمایشە تراژیدیە دایە، بەلام بۆ کەسانێك کە ڕاستەوخۆ کارەساتەکەیان نەبینیوە دەتوانن لانی کەمی ئەو درندەیی‌و مەرگەساتە وێنەبکێشن.

مەسەلەیەك کە دوای 17ساڵ هێشتا لەناو راگەیاندنەکانی کوردستان‌و جیهاندا وونە, کاریگەری جەنگی ئێران- عێراقە لەسەر کارەساتی ئەنفال. کارەساتی ئەنفال لەو چرکە ساتە هەستیارانەدا بەرێوەچوو کە حکومەتە بۆرژوازیەکانی ئەو دوو ولاتە دوا وەرەقەیان ڕادەکێشا بۆ یەکلایی کردنەوەی شەری چەند ساڵەی نێوان خۆیان، لەم کاتەدا بەرەی کوردستانی وە بەتایبەتیش یەکێتی نیشتمانی کوردستان کەدوای شکستی وتووێژیان لەگەل رژێمی بەعس هەرەشەی ریککەوتن لەگەل ئێرانیان لێکردبوو، چوونە پاڵ ئێران‌و بەکردەوە بوون بە بەشێك لە جەنگی ئێران- عێراق.

دەستگرتنی سوپای ئێران بۆ سەر بیرە نەوتەکانی کەرکوك‌و دانانی نەخشەیەکی مقاشی بۆ گرتنی ئەو شارە کە خۆبەخۆ شاری سلێمانیشی دەخستە پشت خۆیەوە، داگیرکردنی شاری هەلەبجەو..بەگشتی بەکارهێنان‌و کەلك لێوەرگرتنی ناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەلاتی یەکێتی نیشتمانی بۆ ئۆپەراسیۆنی هێزەکانی ئێران لەعێراقدا راستەخۆ بوونە هۆکاری تێوەگلانی خاك‌و خەلکی کوردستان لەو شەرە مالوێرانکەرە.

ئەم تاکتیکە نادرووستەی سەرکردایەتی ناسیونالیزمی کورد ، هەلێکی زێرینی بۆ رژێمی درندەی بەعس خولقاند تا نەخشەی لەمێژینەی خۆی بۆپاکتاوکردنی خەلکی کوردستان جێبەجێبکات, لەلایەکەوە بۆ سەرکوت‌و پاکتاوکردنی بزووتنەوەی رزگاری‌خوازانەی گەلی کوردو لەلایەکی تریشەوە بۆ تێکشکاندنی بزووتنەوەی سیاسی ناسیونالیزمی کوردو خۆپاراستن لەمەترسیەکانی پەیوەندی ئەمان بەئێرانەوە.

مێژوو گەواهی ئەوە دەدات کە ئەو رۆژانەی ئەنفالیان بەشوێندا هات، رۆژە پڕ کێشمەکێش‌و پڕ ئالوگۆرەکانی جەنگی ئێران- عێراق بوون, رۆژە چارەنووسسازەکانی پێش کۆتایی هاتنی جەنگەکە بوون، هەردوو بەرەی جەنگ بەروونی دەیانبینی کە ئیترشەڕ گرنگی نەماوەو وەستاندنی دەبێتە ئەمری واقع، بۆیە هەریەکە دەیەویست بەرلەوە جێگەوشوێنی باشتر بۆ خۆی مسۆگەر بکات‌و لە مەوقیعی هێزەوە ئەو بریارە قبوڵ بکات، پێشرەوی‌و شکستی خێرا خێرای هێزە سەربازیەکانی ئەم دوو ولاتە بەدرێژایی سنووری نێوانیان گەواهی ئەو راستیە بوون.

لەبارودۆخێکی وادا بۆ رژێمی بەعس کە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی دووژمنەکانیدا لە هێزەکانی خۆیشی دەستی نەدەپاراست، دەست بردن بۆ جینۆسایدو کۆمەلکوژی کارێکی زۆرئەستەم نەبوو، بەتایبەتیش کە ئەم کارە لە بەرایی ناسیونالیزمی عەرەبدا سەرتای ئیسلام وێڕای سەرکەوتنی گەورە شانازیشی بۆ خاوەنەکانی بەدیاری هێنابوو. بەلام رژێمی بەعس لەو تاوانەدا تەنها نەبوو، ئەوانەشی لەگەل بوون کە لەجەنگی ئێران- عێراق پشتیوانییان دەکردو لەرێگای جۆراوجۆرەوە ئاگری ئەو شەرەیان خۆشدەکرد، کە بێدەنگی سەرسورهێنەری هەموولایەك لەتاوانکاری ئەنفال خۆی ئەو راستیە نیشان دەدات‌و ئێرانیش کەلایەنێکی ئەو شەرە بوو نەك هەر پشتیوانی لەخەلکی کوردستان نەکردو لەگەل هاوپەیمانەکانیان لەسەر ئاگر جێیان هێشتن، بەلکو تەنانەت وەك مەسەلەیەکی ئینسانی لەمەحفەلی نێودەولەتیشدا نەیانوروژاند.

ئەمرۆ دوای 17 ساڵ کاتێك یادی ئەو کارەساتە دەکەینەوەو لەلایەنەکانی ورد دەبینەوە، کە کۆکوژی خەلکی کوردو بێسەروشوێنکردنی سەدان هەزار کەس لەسەردەستی رژێمی درندەی بەعس, دەبینین هێشتا دێوێکی ئەو تراژیدیایە کەبەئەنفال ناسراوە، دیوەکەی تری بریتی‌یە لە نادیاری چارەنووسی ئەنفالکراوەکان‌و ئەو کێشە دەروونی‌و کۆمەلایەتیانەی لێیکەوتۆتەوە، ژێرپێنانی ئەوانەی کە لەئەنفالکراوەکان بەجێماون‌وبۆیە دەتوانین زۆر بەراشکاوی بلێین: پرۆسەی ئەنفال تا رۆژگاری ئەمرۆشمان هەربەردەوامە.

ئەگەر نەخشەدارێژەرو جێبەجێکەری پرۆسەی ئەنفال لە هەنگاوی یەکەمدا رژێمی بەعس بوبێت ئەوا لە دوو ئاستەکەی تردا واتە لەدیاری‌کردنی چارەنووسی ئەنفالکراوەکان‌و لەدابینکردنی مافی جێماوەکانیان دەسەلاتی کوردی بەرپرسیاری یەکەمە بەتایبەتیش کەوەك صلاح موختار لەهاوولاتی‌دا ووتی تا رۆژی رووخانی رژێمی بەعس پەیوەندییان لەگەل بەغدا نەپچراوو تەواوی سەروەت‌و سامانی کۆمەلگەو زۆربەی زۆری بەلگەنامەو دیکۆمینتەکان لەدەستی ئەواندا کۆبۆتەوەو ئەوان دەستیان بەسەردا گرتووە.

# ئەنفال لەبەردەم ویژدانی مردووی سیاسەتدا!

ئاوات محەمەد

ئەمجارەش یادێکی مرددوانەی تری ئەنفال بەڕێوەچوو، ئەو یادەی وەك هەموو ڕۆتینەکانی تر بەبێزارییەوە بەڕێدەکرێتو لەبیردەچێتەوە، ئەوانەی لەو کارەساتەش رزگاریان بوو هەر لەهەمان کارەساتدا دەژینو فرمێسکی چاوەکانیان ووشك نابێەوە، ئەمساڵ کورد بووەتە هێزێکی سەرەکی لەسەر گۆڕەپانی ئێراقدا بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە کوردەکانی ناو کایەی سیاسەتو دەسەڵات ئەوەندە جدیانە بیر لەو کارە ناکەنەوە، کەچۆن ئەنفال لەپرۆسەیەکی سۆزئامێزەوە بۆ پرۆسەیەکی تەواو سیاسی بگوازێتەوە، یان لانی کەم هەوڵ بۆ سڕینەوەی ئاسەوارەکانی ئەنفال لەسەر ناخی ئەو خەڵکە بدرێت، کەتاکو هەنوکە بەدەست سەخترین ژیانەوە دەناڵێنن، بەڵام هەوڵدانێکی بچوك بۆ رزگارکردنی ئەو خەڵکە لەو مەینەتیە نییە، ئەگەرچی لەم ماوەیەدا وەزیری مافی مرۆڤی ئێراقی باسی لەوە کرد با 5٪ ی داهاتی نەوت بۆ قوربانیانی رژێمی دیکتاتۆری تەرخان بکرێت، کەئەمە هەنگاوێکە خۆبەخۆ وادەکات ئەوانەی لەئەنفال رزگاریان بووە، قەرەبوو بکرێنەوە، ئەگەرچی وشەی قەرەبوو بۆ ئەو مرۆڤانە زوڵمێکی گەورەیە، یان باشترە بڵێین سوکایەتییە بەرۆحی هەموو ئەو مرۆڤەی لەو پرۆسە ناشرینە بەد ناوەدا تێداچوون یان شوێن بزرکران، بەڵام دەکرێت ئەوانەی ئێستا لەوپەڕی نەهامەتیدا لەئۆردوگاکاندا دەژین لەو میحنەتە گەورە مرۆییە رزگار بکرێنو ژیانێکیان بۆ دابین بکرێت، شیاوی ئەوان بێت، ژیانێك مرۆڤبوونی خۆیانی تێدا بدۆزنەوە، نەك ئەوەی تاکو ئێستاش لەناو ئەو دۆزەخەدا بژین کەناوی ئۆردوگایە، لەئێستادا ئەگەر رووپێویەك بۆ هەژارترین چینی کۆمەڵایەتی لەکۆمەڵی کوردیدا بکەین، ئەوا ئەوانەی لەئەنفال رزگاریان بووە پلەی یەکەم بەدەست دەهێنن، لەولاشەوە ساڵانە پارەی خەیاڵی لەو یادەدا خەرج دەکرێتو ئەنفال دەکەنە کەرنەڤاڵێکی مرووودی درۆزنانە بەڕێدەخەینو وای نیشان دەدەین ئێمە لەقوربانیەکان قوربانیترین، ئەنفال دەکەینە ئەو رۆژەی زوڵم لەهێزە سیاسیەکان کراوە نەك ئەوەی هێزە سیاسیەکان بەم هەموو ساڵە بچوکترین کاریان بۆ ئەو مەسەلەیە کردووە، بۆنەپرسین تاکو ئێستا وەزارەتی مافی مرۆڤ و ئاوارەو ئەنفال چ پرۆژەیەکی بۆ قەرەبووکردنەوە یان باشترکردنی گوزەرانی ئەو خەڵکە کردووە؟ ئەترسم باس لەو مووچە بچوکە بکەن، ئەگەر لەرووی ئینسانییەوە تەماشای بکەین، ئەوەندەی لەسووکایەتیپێکردن دەچێت ئەوەندە لەموچەیەك ناچێت بۆ خەڵکانێك براببێتەوە، ئازیزانێکیان لەپێناودا بەخت کردووەو سەرچاوەی سەرەکی ئەم دۆخە سیاسیەن، کەهەموویانی لەدەوڵەتی نوێ ئێراقدا کردووەتە بەرپرس.

لەڕۆژی ئەنفالدا تەماشای ئەو هەموو شانۆگەریی و پێشانگاو کۆڕو سیمینارە بکە کەدەکرێت، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەو خەڵکە داماوەی ئۆردوگاکان ئاگایان لەوە نییە چی بەناوی ئەوانەوە دەکرێت، نازانن چی لەوێ دەگوزەرێت، ئەمەیە نەگبەتی ئێمە، ئەنفال وەك هەموو کارەساتەکانی تر لەساڵێکدا تەنها یەك ڕۆژی هەیە، کێ ئازایە لەو ڕۆژەدا قسەی خۆی بکاتو بینێرێت بۆ ڕۆژنامەیەك، ئەگەر بابەتەکەت یەك هەفتە دواکەوت ڕۆژنامەیەك نادۆزیتەوە ئەو نووسینەت بۆ بڵاو بکاتەوە، هەروەها زۆرێك لەئێمەی مەعشەری نووسەران تەنها لەو کاتەدا ئەنفالمان بیر دەکەوێتەوەو دەکەوینە قسەی زلی سەر روپەڕی ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەی بەو یادەوە دەردەکرێتو کەمترین کەس دەیخوێننەوە، ئەمە جگە لەوەی ئەوانەی لەئەنفال رزگاریانبووە یەك وشە لەو وشە زلانەی ئێمە ناخوێننەوە، تەلەفیزۆنەکان لەو ڕۆژەدا هەمووامان دەخەنە گریانو سوێی ئەو هەموو بێوەژنو پیرێژنانە دەکولێننەوە، کەئەمان تەنها ئەوەیان لێیان دەوێت چەند کاتێکی کەم شاشە سواوەکانیان پێپڕبکەنەوەو سەرکردەکانی لەو پەڕی نازو نیعمەتدا دەژین لێیان رازیبنو پێیان بڵێن دەستانخۆش بۆ ئەو کارە بەسۆزو پڕ لەهەستە مرۆییە، ئافەرین، بڕۆنە لای بەرپرسی دارایی ئەوەندە موکافەئە لەسەر حسابی ئەو هەموو ژنو منداڵانەی ئۆردوگاکانی سمودو شۆڕش وەربگرن، ئەمەیە کارەساتی یادکردنەوەی کارەساتی ئەنفال، ئەمەیە هەموو هەڵوێستی ئێمە لەو ڕۆژەدا، کەدەمانەوێت بەو هەموو ئازارانەی ئەوانەوە بچینە بەردەم مێژوویەکی دژوار، کەجگە لەتۆمارکردنی چەند لاپەڕەیەکی لاواز هیچی تر ئەنجامنادەین، لەبەرئەوە بالەئێستاوە خۆمان بۆ یادی ئەنفال ئامادە نەکەین، بەڵکو هەوڵبدەین لەیادی ئەو کارەساتەدا کەمێك دڵی ئەو منداڵو هەرزانەی ئەو شوێنە پەراوێزکەوتوانە خۆش بکەینو خوێندنگاو شەقامو کۆڵانو ماڵەکانیان بۆ چاك بکەینەوە، کەپڕیەتی لەنەهامەتی، لەئۆردوگایەکی وەك شۆڕشدا تاکو ئێستا لاوان شوێنێکیان نییە تێیدا کۆببنەوەو هەندێك لەدەردە دڵەکانی خۆیان بۆ یەکتری باس بکەن، ئەگەرچی لەماوەی ئەم ساڵەدا زۆر هەوڵمدا شوێنێك بدۆزمەوە هاوکاری لاوانی ئۆردوگای شۆڕش بکات، بۆ کردنەوەی سەنتەرێك، بەڵام تاکو ئێستا کەسێك وەڵامی ئەو پێداویستیەی نەداوەتەوە، کەدەتوانم بڵێم کەس ئەو کێشەیە بەکێشەی خۆی نازانێتو نەزانیوە، ئیدی چۆن بڵێین ئەنفال گەوروترین کارەساتە بەسەر ئەم نەتەوەیەدا هاتووە، ئەوەتا خۆمان ئەو کارەساتە بەشێوەیەکی تر دووبارە دەکەینەوە، ئەو ناوچانەمان واپەروێز خستووە، خەریکە دەبێتە مەڵبەندی سەرهەڵدانی گروپە توندڕەوەکان، دەبێتە مەنزڵگەیەك بۆ دواکەوتوویی، ئەوەندەی ئەو خەڵکە رقی لائەستوور بووە، ئەوەندە خۆشەویستی لادرووست نەبووە، هۆکارەکەشی ئەوەیە کەس بەچاوی خۆشەویستیەوە تەماشای ئەو مرۆڤە پەراوێزیانەی نەکردووە، حکومەت تاکو ئێستا کەمترین خزمەتگوزاری بۆ ئەو شوێنانە تەرخان کردووە، ئەمە جگە لەبوونی چەندەها نەخۆشی جەستەییو دەروونی لەوناوچانەدا کەزۆربەی پاشماوەی ئەنفالکراوەکانی لێدەژین.

یەکێك لەکارەساتەکانی تر ئەوەیە، تاماوەیەك لەمەوبەر دنیایەك شەڕی ئاینی لەسەر ئەوە دەکرا کەنابێت ئەو بێوەژنانەی مێردیان ئەنفالە هاوسەرگیری بکەن، بەوەی ئەمان ئەبێت چاوەڕێ بن تاکو چارەنووسی مێردەکانیان دیاردەکەوێت، بەڵام کەسێك نەبوو بڵێت نابێت ئەو ژنانە برسی بن یان بێلانەو بێ ژیان بن، کەس خەمی ژیانی ئەوانی نەبوو، بەڵکو خەمی ئایدۆلۆژیای خۆیان بوو، ئەمەیە کارەساتی نەتەوەیەك کەئەم جۆرە بیرکردنەوانە تادوا ئەندازە دەیبات بەناخی زەویدا، ژیانو مردنی لادەکات بەیەك، تەنها لەو شتانەدا پەیوەندی بەو مەسەلانەوە هەیە، کەبەشێکە لەئایدۆلۆژیای ئەم، بەڵام وەکوتر کەقسەیەکی خێر لەژیانو گوزەرانی بکات ئەوە کاری ئەو نییە، ئەو ئایدۆلۆژیستانە وایان دەزانی ئەو ژنە نەگبەتانە تەنها لەشوکردنەوەیان کەمە، ئەمانە نەیاندەزانی ئەوان لەهەموو ژیانیان کەمە، هیچیان نەبووە بیخۆن، ئیدی چۆن بیر لەمەسەلەیەك بکاتەوە کەتەنها لەئەقڵدانی ئێوەدا بوونی هەیە، ئەنفال بووە سەرچاوەی دنیایەك مەسەلەی سیاسی، زۆر موزایەدەی گەورەی پێوەکرا، بەڵام ئەنفالکراوەکان خۆیان لەوپەڕی نەگبەتیدا دەژین.

ئەمساڵ بەهۆی کۆمەڵێك گۆڕانکاری سیاسی گەورەوە لەوانەیە کورد بەشێوەیەکی گەرمتر بەرفراوانتر یادی کارەساتی ئەنفال بکاتەوە، ئاهەنگو چالاکی گەورە گەورە سازبدات، وەك چۆن بۆ هەڵەبجە دەیکەنو لەهەڤدەی مانگدا هەڵەبجەمان بیر دەچێتەوە، ئاواش لەپانزەی مانگدا ئەنفالمان لەبیر دەچێتەوە، بەئەندازەیەك ئەو کارەساتە دەبێتە دوو کارەسات، کەئەنفالکراوەکان سەریان لەو هەموو درۆیە سوڕ دەمێنێن، کەئێمە بەدەمیانەوە دەیکەین، بەپێی ئەو هەموو چالاکیو نوسینو وتارانە بێت، هەموو نەگبەتییەکانی ئەوان کۆتایی دێت، بەڵام باکەمێك بەویژدانەوە سەردانێکی سمودو شۆڕش بکەین، بزانین چۆن تەریقی بەرۆکمان دەگرێت، کەسیمای هەموو مرۆڤەکانی ئەو دەڤەرانە مردنی لێدەتکێت، منداڵەکان لەپیر دەچن، لەبن دیوارەکان لەتاو نەهامەتیەکانی خۆیان دۆش داماون، مەرگ لەلێویان دەبارێت، رۆحیان وەك خاکی ئۆردوگەکەیان وشك هەڵهاتووە، ئەوان لەناو چیرۆکەکانی ئەنفالدا خۆیان دەدۆزنەوە، پیرێژنەکان ئەوەندەیان چیرۆکی کارەساتی ئەنفالیان بۆ کەناڵەکان گێڕاوەتەوە، دەتوانم بڵێم باشترین چیرۆکی ئەنفال ئەوان دەیگێڕنەوەو باشترین چیرۆکنووسیان لێدەرچووە، ئەوەندەیان باسی مەرگی ئازیزانیان کردووە، هەموو وشەکانیان دەرخکردووە، بەڵام بەدڵنیاییەوە پێتان دەڵێم ئەوان گەورەترین شتیان لەبیرچووەتەوە، ئەویش ژیانە ئەو ژیانەی ئێمە لێمانسەندنەوە تاکو کورسی دەسەڵاتی پێقایم بکەین، لێرەوە بەهەموو سیاسیەکانی ئەم وڵاتە دەڵێم لەرۆژو یادی ئەنفالدا، تەماشایەکی ژێر کورسیەکانتان بکەن بزانن چەند کارەساتی منداڵو ژنی ئەنفال لەژێر ئەو کورسیەی

## ئەڤین ئیبراهیم فەتاح, لەیادی کارەساتی ئەنفالدا:

# ساڵانە برینی ئەنفالکراوەکان دەکولێنینەوە بەبێ ئەوەی هیچیان بۆ بکەین..

-1نزیکەی شەست ساڵ پێش ئێستا جووەکانی ئەڵمانیالەسەر دەستی هیتلەر دووچاری کارەساتی هۆڵۆکۆست بوون، بە پێی سەرچاوەکانی خۆیان نزیکەی 6 ملیۆن کەسیان (کە 1.5 ملیۆنیان منداڵ بوون) کوژرانو سووتێنران، وەلێ خوێنیان بە فیڕۆ نەچوو، ئاخر جووەکان زۆر زیرەكو هوشیار بوون ونەیانهێشت ئەم کارەساتە بە ئاسانی بەسەریاندا تێپەڕێت، ئەوان بە سوور بوون لەسەر پرسەکەیانو بە پشت بەستن بە راگەیاندنی خۆیانو راگەیاندنی جیهانی، قەوارەی کارەساتەکەیان بە هەموو دونیادا بڵاوکردەوە، ئەوێ رۆژێ چەمکەکانی مافی مرۆڤ، داپەروەری، دیموکراتی و......تاد، لە جیهانی مۆدێرنەدا تازە بڵاو دەبوونەوە، ئەوە بوو ئەڵمانیاو سەرجەمی ئەوروپا کەوتنەژێر فشاری ڕای گشتیی جیهانییەوەو ناچار بوون جگە لە داوای لێبوردن، سەرجەمی جووەکان قەرەبوو بکەنەوە، کە دوای کەمتر لە دە ساڵ بەسەر کارەساتەکە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیلی لێکەوتەوە کە گەرەترین دەسکەوت وبەرهەمی خوێنی قوربانیانی هۆڵۆکۆست بوو ، جگە لەوەی ئەڵمانیاو سەرجەم وڵاتە ئەوروپاییەکان، ساڵانە موچەی تایبەتیان بۆ پاشماوەی قوربانییەکانی هۆڵۆکۆست بڕیوەتەوە. بۆیە دەکرێ بڵێین جووەکان توانیان هۆڵۆکۆست بکەن بە مێژووو سوود لە کارەساتەکەیان وەرگرن.

بۆیە باسی هۆڵۆکۆستی جووەکان دەکەم، چونکە ئەم کارەساتە لە زۆر لایەنەوە لە کارەساتی ئەنفالی لەمەڕ خۆمان دەچێت، کەچی ئێمەنە ئەوەیە سوودمان لە کارەساتەکە وەرگرتبێتو نەئەوەشە واز لە پاشماوەی قوربانیەکانیان بێنین، ساڵانە برینیان دەکولێنینەوە بە بێ ئەوەی هیچیان بۆ بکەین!!

بەڵێ، تا ئەمڕۆش راستیەکانی کارەساتی ئەنفال بە پێی ویستی دەسەڵاتدارانی کوردستان شاردراونەتەوەو خوێنی قوربانیان بە فیڕۆ چووەو پاشماوەکانیشیان لە قورسترین باری ژیاندان، تەنانەت ژمارەشیان بە تەواوەتی دیکۆمێنت نەکراوە.

-2چەند ساڵێك لەمەوبەر، حکوومەتی هەرێمی کوردستان-هەولێر، کۆنفرانسێکی زانستی دەربارەی کارەساتی ئەنفال لە هەولێر رێکخست، تیایدا چەندین پرۆفسۆرو دوکتۆرو رۆشنبیر بابەتیان پێشکەش دەکرد، منیش وەکو رۆژنامەنووسێك لە کۆنفرانسەکەدا چەند جارێك ئامادەبووم، جارێکیان پێش ئەوەی بچمە ژوورەوە، مێرد منداڵێك لێم نزیك بووەوە، دیاربوو دەرۆزەی دەکرد، دوای کەمێك دەمەتەقێ پەنجەی بۆ پیرە ژنێك درێژ کرد, کە لەوبەری جادەکە بوو گوتی: دایكو باوکم ئەنفالن، تەنها منو نەنکم ماوینەتەوە و کەسمان نیە بەخێومان بکات, بۆ ئەوەی بژێین دەبێ دەرۆزە بکەین...کە گوێم لەو قسانە بوو بڕیارمدا چیتر لەو کۆنفرانسەدا ئامادە نەبم.

جارێکی تریش سەردانی کۆمەڵگەی زۆرە ملێی بنەسڵاوەم کرد، بە نیازبووم کۆنفرانسێك لەسەر گرفتەکۆمەڵایەتیەکانی پاشماوەکانی ئەنفال بکەم، چەندین کێشەم بەرچاوکەوتن هەر بۆ نموونە کە رێکخراوێکی بیانی دەهاتو مەڕومالاتی بەسەردا دابەش دەکردن، جگە لەوەی بەشی هەموویانی نەدەکردو بە واستەش دەستیان دەکەوت، مەڕومالاتەکانیش سیسو نەخۆش بوون، پیرە ژنێکم بینی پڕ بە گەرووی هاواری کردو گوتی: کارەساتی ئێمە بووەتە مایەی کاسبیو دەڵەمەندبوونی ئێوە، هەموو رۆژێ دێن ودەچن و ناومان دەنووسن و وێنەمان دەگرن، قسەمان لێوەردەگرن، باشە ئێوە قەت شەرم ناکەن، ئەمە ژیانە ئێمە تێیداین؟

من سوپاسی پیرە ژنەکەم کردو بەجێم هێشت بەڵام زانیم کە لە هەر کۆمەڵگەیەکدا کە تووشی ئەو جۆرە کارەساتانە بووبن، زۆربەی ئەو کەسانەی کە دووچاری ئازاردان بوون، خودانی چیرۆکە چەپێنراوەکانی خۆیانن، ئەو چیرۆکانەی هێشتا باس نەکراون، ئازاردان خراپترین تاوانە، کە بەردەوام بێتو مرۆڤ نەتوانێت بیدرکێنێ، ئا ئەمە تاوانێکی گەورەترە......ئەرکی رۆشنبیر ئەوەیە کە دیواری بێدەنگی بشکێنێتو ئازارەکان ئاشکرا بکات، چونکە ئەمە تاقە رێگاچارەیە کە دەسەڵات ناچار بکات، تا چیتر ئەو قوربانیانە ئازار نەدرێن.

-3لە کارەساتێکی ئاوادا، کە پاشماوەکانیشی هەر قوربانین، بەڵام قوربانیی زیندوون، هەر یاد کردنەوەیەك بەبۆچوونی منەوە دەبێتە مایەی ئازاردان، ئەوان واهەست دەکەن کە بازرگانی بە ئازارەکانی ئەوانەوە دەکرێت، من هەرگیز لەگەڵ ئەوەدا نیم رۆژی یادکردنەوەی ئەو ئازارانە دابنرێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە، هەق وایە کارەساتی ئەنفال ببێت بە مێژوو، لە لایەك سوودی لێوەربگیرێت بۆ ئەوەی خوێنی قوربانیەکانی بە فیڕۆ نەچێتو لە لایەکی دیکەشەوە، پاشماوەکانی ئەنفال, کە مرۆڤی لێقەوماون، قەرەبوو بکرێنەوەتا کەمێك ئازارەکانیان ژبیر بکەنو ژیانێکی نوێش دەست پێبکەن.

ئەم بابەتە کۆی وەڵامی چەند پرسیارێکن کەماڵپەڕی دەنگەکان لەیادی کارەساتی ئەنفالدا ئاڕاستەی نوسەری کردبوو, لەبر گرنگی بابەتەکە ئەنفالستان جارێکی تر بەشیاوی بڵاوکردنەوەی زانی.

## کۆنە جاشێك لەرۆڵی جاش دەدوێ لەئەنفالدا "

# * هەندێك لەجاشەکان لەگوندەکاندا دەگەڕان وپەلەوەرو شتومەکیان دەدزی

# * جاشەکان زۆرجار چاوساغی رژێم بوون لەناوچەکەدا

ئا:سەلام عەلی:

لەساڵی 1988و لەسەروبەندی پرۆسەکانی بەدناوی ئەنفالدا, رژێمی بەعس پارەیەکی زۆری تەرخان کردبوو بۆئەوەی ژمارەیەك لەکورد لەخۆیان کۆبکەنەو, سەرۆك جاشەکان خەڵکیان لەدەوری خۆیان کۆکردبوەوەو هەندێك خەڵك بەناوی (افواج خفیفە)کەژمارەیەکیان کەسی دڵسۆزبوون ولەماڵی خۆیاندابوون بێ ئەوەی زیانیان بۆ شۆڕش هەبێت, بەلاّم لەساڵی 1988 رژێم ناچاری کردن کەدەبێت چەك هەڵبگرن وبەشداری لەئەنفالەکاندا بکەن.

کەمن ئەوانەی کە لە دڵسۆزیان بۆ مێژوی گەلەکەیان کەکۆنە جاشن بەراستیەوە لەمێژوی جاش ورۆڵیان لەپرۆسەکانی ئەنفالدا دەدوێن, (ع.ب)لەو جاشانەیە کەروداوەکان وەك خۆی دەگێڕێتەوە, ڕاستە لێرەدا وەك جاشێك ناوی دەبەین بەلاّم کەسێکی دڵسۆزەو بەڕاستیو دڵپاکییەوە ڕاستی ئەو ڕووداوانە ڕوون دەکاتەوە ودووراو دوور پەلامارەکانی بینیوەوقسە لەسەر رۆڵی جاش وهێزەکانی رژێم بەتایبەتی گاردی کۆماری دەکات. دواجار بەرێز (ع.ب) بەم شێوەیە وەلاّمی پرسیارەکانی دایەوە :

**پ : لەج فەوجێکدا بووی ؟**

و: لەفەوجی شێخ تەیب ژمارە (203).

**پ: ئەو دەمانەی پرۆسەی ئەنفال دەستی پێکرد ئێوە لەچ قۆلێکدابوون؟**

و: لەسەنگاو بووین ئەو رۆژە بوو کە لیوایەکی تانك هێرشیان کرد بۆ ئیسلامیەکان, یەکەم رۆژ کەئێمە گەیشتینە ئەوێ بینیمان (40)تانك و (5)کۆپتەر بۆردومانیان دەکرد لەگەڵ ئەوەشدا جاشەکان لەگەڵ لیوایەکی مغاویردا بەشداری شەڕەکانیان دەکرد, بەلاّم منیان نەبردە نێو شەڕەکەوە چونکە ئەو دەمە منالّ بووم, لەمرکزی پۆلیسی سەنگاو مامەوە, بەلاّم چەند جارێك لەگەڵ سەیارەی ئامر سرییەکەمان کەئێستا لەهەندەرانە ئەچووینە نزیك جەبهەکە دەمانبینی کەشەڕو بۆردومان بوو کاتێك بۆ ئێوارە شەڕەکە کۆتایی پێهات هاتنەوە گووتیان مەقەری (ئیسلامیەکان)مان گرتووە, ئیتر ئەو هەموو جاشانەی (ش.ت)هەموویان کە هاتنەوە بەتانیی وکەلوپەلی زۆریان هێنابوو لەگەڵ خۆیان.

**پ: ئەو هێزەی کەرژێم بەکاری دەهێنا چ جۆرە چەکێکیان پێبوو؟**

و: هەموویان تانکی زنجیرو لیوای مغاویرو پێنج کۆپتەریش.

**پ: دیمەنی گوندەکانت دەبینی لەکاتی سووتاندا؟**

و: من خۆم ئەو کاتانە چوومە گوندی (پێنجەمۆز9 دوکەلی لێهەڵدەستاو روخێنرابوو, جاشەکان هەموویان پەلاماری پەلەوەرو ئاژەڵی گوندەکەیان دەدا و دەیان برد, لەپێش ئێمەشەوە, لیوایەکی رژێم وجاشەکانی تریش, چووبوونە گوندەکەوە ئاژەڵە گەورەکانیان بردبوو.

**پ: ئەوکاتە تۆهەستت چۆن بوو؟ کە جاشەکان ئاوایان لەماڵی زمانانی خۆیان دەکرد؟**

و: من خۆم ئەو کاتە زۆرم پێناخۆش بوو, بەحوکمی ئەوەی تۆزێ عەرەبیم دەزانی دوو سەربازی رژێمم لەگەڵ بوو گووتیان تۆ بۆ گۆشتی ئەو پەلەوەرانە ناخۆی پێم گووتن نایخۆم چونکە حەرامەو ماڵی خەڵکە, ئەوانیش بەقسەی منیان کردو نەیانخوارد جاشەکان بەسەیارەی (ئیڤا) بەرخیان دەهێنا لەگوندەکانەوە وهەر جاشەو دانەیەکی بەردەکەوت بەلاّم ئێمە ئەوەشمان وەرنەگرت, کەچی جاشی واهەبوو هێندە بێویژدان بوو هەتا بوکەشوشەو (نوخانگر)ی دەهێناو دەیدزی.

**پ:جاشەکان ناکۆکیان دەبوو لەبەرئەوەی هەندێك ڕەفتاری ناشیرینیان دەنواند وئەوانی تر پێیان ناخۆش بێت؟**

و: ناکرێ بڵێین جاشەکان هەموویان خراپن, نیوەیان خراپ بوون بەتایبەت ئەوانەی کەپارەی باشیان وەردەگرت گوێیان بەهیچ نەئەدا, جاشی واهەبوو هێندە زاڵم بوولەیەك شوێندا (11) کەری کوشت.

**پ: دیمەنی تر کە ئەو ڕۆژانەی لەگەڵیان بووی؟**

و: من هەر نزیکەی دوو وەجبە لەوێ بووم کە چومەوە شوێنەکەمان گۆڕدرابووچووینە (ئاش داخ)بۆ (ئاوایی (قەلاّرێویلە)جاشەکان دەچوون دەگەڕان ماڵ بەماڵ بۆئەوەی شتیان دیست بکەوێ.

**پ: جاشەکان چاوساغی هێزەکانی رژێمیان دەکرد بەدوای ئەو هاوڵاتیانە بکەون لە گوندەکانیان هەڵهاتبوون؟**

و: من بەچاوی خۆم نەمدیوە بەلاّم باسی دەکەن چونکە ئەگەر جاشەکان لەپێشەوەی ئەوهێزانەی رژێم نەبوایەن نەیاندەتوانی بەئاسانی بچن. ئێوارانێك ئێمە لەوێ بووین چوار پێنج کۆپتەر دەبوونبەسەر دۆڵەکاندا دەگەڕان دەیان ووت فلانە کۆپتەر فلانە جاشی تیایەو چاوساغیانە؟

**پ: دەگێڕنەوە هەندێك جار ئەفسەرەکانی رژێم بەشەق لەجاشەکانیان داوە بۆئەوەی بیانخەنە پێشی خۆیانەوە؟**

و: وەڵلاهی دەبێ ڕاست بێت,چونکە ئەو دەمانەی هێندە نەدەچووینە شەڕەکان ئێمە سێ برابووین پارەمان دەدا نەدەچووینە واجب بەلاّم دواتر کە تەنگیان پێهەڵچنین من رۆیشتم ئەو کاتانە لەکۆتاییەکەیدا بوو.

**پ: چ دیمەنێکی ترت بینی لەو ڕوداوانە کە هەستی جولاندی؟**

و:دیمەنەکان زۆرکاریگەریان هەبوو چونکە من منالّ بووم وبەزۆربرابووم,کەدەمبینی گوندەکان ڕوخاون چۆڵن زۆر دڵتەنگ دەبووم.

**پ: ئایا ئەو سەربازانەی کەلەگەڵتان بوون قەت بەجاشەکانیان نەدەگووت بۆ وادەکەنو خیانەت دەکەن لەگەلەکەتان؟**

و: پرسیاری لەو جۆرەیان دەکرد, هەندێك جاش هەبوون شەوانە لەگەڵ پیاوانی رژێم دەردەچوون لەوانە یەکێك ناوی (ح.ع)ئامر سرێ بوو خەڵکی ڕزگاری بوو کە بەیانی دەهاتنەوە دەیانوون ئەمشەو پێشمەرگەمان بینیوە وتەقەمان کردووە ووامان کردووە.

**پ: بەگشتی هەڵوێستت چیە لەسەر جاش؟**

و: جاش ناوەکەی بەخۆیەوەیەتی و نۆکەرن, غەدرکراوە لەکەر کەناوەکەی لەو نۆکەرانە نراوە چونکە کەر لەشۆڕشی نوێدا پێشمەرگە بۆ ڕاپەراندنی کارەکانی سودیان لێ بینیوە.



# چیرۆکی عاسی مستەفا پەڵەیەکی ڕەشە بەتەوێڵی شۆڤێنیزمی عەرەبیەوە

**ئەنفالستان**

چیرۆکی ئەوکارەساتەی بەسەر عاصی مستەفاوئەنفالکردنی خێزانەکەی هاتووە, نەك بە چەمچەماڵوکوردستان بەڵکو بەجیهانیش نامۆنیە, عاصی کە سەربازێکی یەدەگی قادسیەی سەدام بووەولە شکستێکی سوپای عێراقدا بەدیل دەگیرێو پاش 9ساڵ دیلێتی لە ئیران ئازاد دەکرێو دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان, بەلام کاتێك دێتەوەودەیەوێت بڕواتەوە بۆماڵەکەی خۆی بەسەر هەواری خاڵیدا دەگەڕێتەوەو دەزانێ خێزانەکەی هەموویان لەلایەن بەعسەوە گیراون, ئەویش وەك سەربازێکی عێراقی بۆ سۆراخیان دەچێتە لای دامودەزگا ئەمنیەکانی بەعس لەچەمچەماڵ, بەلاّم کەدەزانێ پیاوانی بەعس وەك ڕەوشتی هەمیشەییان دەستی دەستیودرۆی لەگەڵ دەکەن, ئیتر پەتی تەحەمولی دەپچڕێوبەسکالاّیەکی پاڕانەوە ئامێزەوە دەچێتە دیوانی سەرۆکیکی بێڕەحمودڵڕەق جەنابی سەدام حوسێن, ئەوسەرۆکەی ناوی فریشتەو باوکی نەتەوەی لەخۆی نابوو, بەلاّم سەرەئەنجام پاش چەند رۆژێك لەچاوە ڕوانی لەلایەن سەرۆکی دیوانی سەدامی دڵڕەقەوە بە ئیمزای ( سعدون علوان مصلح ) زۆر بەکورتی وەلاّمی دەدەنەوەو پێی دەڵێن : بەداخەوە ژنەکەتو منداڵەکانت لە پرۆسەی ئەنفالی باکوردا ونبوون, ئەمە حیکایەتێکە لێوان لێوە لە ناپەسەندیوپێشاندەری کارەکتەرێکی وێرانکەرە, ڕەوشتی سەرکردەیەکی ناسیونالستی عەرەبە کەهیچ بەهایەکی بۆمرۆڤو مرۆڤایەتی نەهێشتۆتەوە, سکالاّی عاصی بەدەیان زمان بلاّوکرایەوەو رۆژنامەکانی جیهان شکستی سەربازێکی پەشیمانی عێراقیان گەیاندە ئەوسەری جیهان, ئەوسکالاّیەی دڵنیام بەقەد ژمارەی پیتوووشەکانی فرمێسکیان بەومرۆڤانە رشتووە,کە پەتای دەمارگیری کوێی نەکردوون ومرۆڤانە بیرلەژیان دەکەنەوە, کەچی ئەوەی گوێی خۆی لێخەواند ئەعلامی عەرەبی بوو, ئەوەی شەرعیەتی دەدایە سەدامو بەعسیەکان لەبەرانبەر وەها کردەوەیەکی نامرۆڤانە بیری شۆڤینی عەرەبی بوو, ئەوەی پاش ئەنفالوجینۆسایدکردنی کوردیش, سەدامی بەسەرۆکێکی لێوەشاوە ناوزەد دەکرد دەمارگیری نەتەوەیی عەرەب بوو. ئیدی بۆ مافی ئەوەمان نەبێت دەمارگیری ناسیونالستی ڕیسوا بکەین, بۆ نەتوانین بەوپەڕی جورئەتەوە بڵێین, نەفرەت لەبیری شۆڤینی جالەهەر دەقێکی پیرۆزەوە سەرچاوەی گرتبێ. نەفرەت

# نامەیەکی ئازاد بۆ ئەنفالچییە زیندانیەکان.

لاس













- **بۆ بەرێز/ سەرۆکی فەرماندەی پێشوو**
- **ئەفسەروپلەدارو جەنگاوەرە قارەمانەکانی ئەنفال**
- **جاسوسە فێلبازەکانی بەعسی گۆڕبەگۆڕ**
- **کاربەدەستو توڵەوتانجیەکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان**
- **چ ئەوانەی ئەمرۆ لەزیندانی ئەمریکیە کافرەکاندان یان لەعێراقی نوێ کار بەدەست ودەمڕاستی خەڵکین**

ئەمرۆ پاش حەڤدە ساڵ لە کارەساتە خوێناویەکەی ئەنفالی کوردان, کە جەنابتان سەرپەرشتیار وجێبەجێکارو تالاّنچی هاوڵاتیان بوون, پێمخۆش بووبەوبۆنەیەوە ئەم نامەیەتان ئاراستەبکەم ولەناخی دڵەوە بۆتانی بنێرم, دەمەوێ پێتان بڵێم ئێوە بەهەڵە چووبوون کە ویستتان میللەتێك لەبنو بێخەوە هەڵکێشن, تەعریبوتەرحیلی بکەن, ئەنفالوجینۆسایدی بکەن, ئەگەرچی کردتانو کوشتتانو بڕیتان, ڕوخاندتانو سووتاندتان, بەگریانمان پێکەنینو لەشینمان شایتان کرد , لەمەرگمان دەستتان نەپاراستولەتێگەیشتنمان خۆتان گێل کرد , خۆتان دەستبەرداری بەعس نەدەبوون و دەتانویست دوای ئەنفالیش بمانکەن بەبەعسی! بەڵێ بەعسی ئەو دوو پێیەی لە هەموو دنیادا لەخۆی ناشرینتر نیە, خۆتان ملکەچی سەرۆکی دڕندە بوونو دەتانەویست ئێمەش مل کەچ بین, لەم پێناوەدا زۆرتان کرد , هەرچی چەکی قورس بوو بۆ کوشتنمان خستتانە کار کەچی سەرسەخت بووینو هەرنەفەوتاین, خواردنتان لێبڕین بۆئەوەی بمرین لەبرسان, ئەوەتاین هەرماینەوە, دواجار چەکێکتان بۆهێناین لەسایانید, لەبۆنی سێوو پرتەقاڵ, بۆ ئەوەی لەبرسا بەتاسەوە هەڵیان مژینوبەکۆمەڵ قڕمان تێخەن, وای لەگەمژەیی ئێوە ؟! میلەتێك چۆن فەنا دەبێت؟ وای لەگەوجێتی ئێوە مرۆڤ چۆن بەگێلێتی ئێوە بەڕێوە دەچێت؟! ئەوەتا بینیتان ئێوە رۆیشتنو ئێمە ماینەوە, ئێوە ڕیسوابوونو ئێمە سەربڵند, دارستانەکان بوژانەوە, کانیەکان تەقینەوە, منداڵەکانی ئەنفال چونەوە بەرخوێندن, چۆلەکەکان هاتنەوە لەسەمای گیرانوڕیسوابوونتاندا جریوەیان دنیای پڕکرد ,لەڕوخانتاندا هێندەگریان, خەریك بوولەو بەستەزمانانە بکەومە گومانەوە, بەلاّم دواتر زانیم ئەوانیش بۆ ئەو باڵندە ئازیزانەی خۆیان دەگریان کە لەئێوارە وەختێکی کۆڕی جریوەی خۆیاندا بەکۆمەڵ بەرهێرشی خەردەل کەوتبوونو تاقیان بەسەلامەتی دەرنەچووبوو, عاصی مستەفا خێزانی پێکەوەنایەوەو منداڵی تری هێنایەوەناوژیان, شیخ حسێنی هەزارکانی پاش ئەوەی بەزەیی پیاهاتنەوەکەی سەرۆکتانی ڕەتکردەوە, بەخۆیود12سەرخێزانەوەبردتانن ونەمان بینینەوە, بەلاّم نەوەیەك مرۆڤی چۆك دانەدەری بەجێ هێشت, ئێوەهێندەسپڵە بوون وەفاتان بۆئەو کوندە پەپووانە نەبوو کە هاتبوون پاش ئەنفالکردنی هەرگوندێك ئاوازی مەرگدۆستانەی خۆیان بەسەر پریاسکەی پیرە ژنە ئەنفالەکانەوە بخوێنن, کەچی بەوهەموو شوومیەی خۆیانەوە, لەزەبری نامەردانەی ئێوە قووتار نەبوونوبەرچەکی کیمیایی کەوتن, بەگێلیتی هاتن بەسەر وێرانی گوندەکانی ئێمەدا بخوێنن, کەچی ئەوانیش ئەنفالکران جینۆساید کران, بۆیە ڕۆژی9نیسان لەمەرگی دەسەڵاتی ئێوەدا فیشکەی سمێڵیان دێت, ئێوە هێندە ناشرینن, هەرخۆتان بەخۆتان بن, ئەوەندە دزێوبوون نەتان دەزانی شەرم چییە؟ ولەدابونەریتی چ میلەتێکەوە هاتۆتە ئێرە, ئێوە شەرم سڵتان لێدەکاتەوە دڕندە خۆتان لێلادەدا نەکا بەسەلاّوێکتان هەمووحورمەتی لەدەست بچێت , ئێوە لەهیچ ناچن لەخۆتان نەبێت هەی بەعسیە مرۆڤ کوژەکان, ئێوە نەدەژیان بۆیە ژیانتان بۆکەسیش نەدەویست هەی دووپێ عەفلەقیەکان.

# فرانس ڤان ئانرات، ئەو تاوانبارەی بەعەلی کیمیایی هۆڵەندا یان(پیاوێك لەمردن) ناوزەدەکرێت, ئێستا لەبەردەمی داداگادایە؟

**چاوپێکەوتن / باوکی لۆڤان**

**هەرلەدوای روخانی رژێمی سەدام حسینەوە گەورەتاوانبارێکی هولندی کە پێشتر نزیکەی 1960تەن مەوادی کیمیاوی بەرژێمی عێراق فرۆشتبوو بۆماوەی 14 ساڵ لەبەغدا مابووەوە تا روخانی رژێم ئیتر ئەویش هەڵدیّ ودەیەوێت بگەڕیتەوە بۆ هۆڵەند, بەڵام پاش ماوەیەکی کەم هەواڵی گرتنی تاوانبار فشرانس ڤان ئانرات(frans van (anraat بڵاوکرایەوە ئێمە بۆبەدوا داچوونی زیاتر لەبارەی ئەم گەورەتاوانبارەی چەکی کۆکوژ, پەیوەندیمانکردبە بەرێز ئەمیر قادرەوە کەبەرپرسی کەیسەیەکەیەتی لەناوەندی هەلەبجە دژبەئەنفال وجینۆساید، لەدادگای هۆڵندا ,**



**ئەمیر قادر بەرپرسی کەیسی فرانس ڤان**

**ئەنفالستان : فرانس ڤان ئانرات frans van کێیە ؟ پەیوەندیەکانی بەرژێمی بەعسەوە چی بوون؟ ئێوە بۆچی لەدادگا داواتان لەسەر تۆمارکردووە؟**

فرانس ڤان ئانرات کە ئەمرۆ لەمیدیاکانی هۆلەند بەعەلی کیمیایی هولەندی ناوزەد دەکرێت, خەڵکی باکوری هولەندایەوهەرلە زووەوە خەریکی بازرگانی کردن وکاری بازرگانی بووە لەهۆڵندا ودەرەوەی هۆڵند, بەتایبەتی بازرگانی بەمادەوکەرەسەکیمیاییەکانەوە,سەبارەت بە عێراقیش. کە وەڵامی پرسیارەکەی ئێوەیە, ناوبراو بەرپرسیارە بەرانبەر کڕین وفرۆشتن وبازرگانی کردن بەوچەك وبەش وکارگانەی کە چەکیی کیمیایان بۆرژێمی عێراق بەرهەم هێناوە, بەپێی ئەوبەڵگەنامانەی کەلەلێکۆڵینەوەکانی –un-و وەزارەتی دادی هۆڵندیشدا هەن فرانس وەك بەرپرسی سەرەکی لەدابین کردن وبازرگانی پێوەکردنی چەکەکانی رژێمی بەعس دەناسرێت, یان وەك هاوکارێکی بنەڕەتی بەعس تاوانبارە بەکیمیابارانکردن وکوشتنی بەکۆمەڵی خەڵکی کوردستان وجینۆساید کردن, پێمخۆشە لێرەوە ئیشارەت بەوەش بدەم کەئەم تاوانبارە لەکۆتایی ساڵانی هەشتادا لەئیتالیا گیراوەو دەبوو بچێتە بەردەمی دادگا, بەتاوانی بازرگانی کردن بە گازەقاچاغەکان ومادەدە کیمیایەکانەوە, کە ئەو سەروەختەی دەیگەیاندنە رژێمی بەعس بەڕیگای ئیتالیادا, بەڵام بەومادانەوە گیرا, فرانس ڤان توانی ئەو جارە لەدەست دادگا ڕابکاو خۆی گەیاندەوە لای رژێمی بەعس وتا ساڵی2003 لەعێراق مایەوە واتا هەتا ڕوخانی یەکجاری حکومەتی سەدام,لەلایەن ئەورژێمەوە پەنادرابوو, درێژەی بەکارەکانی دەداوهاوکاری رژێمی سەدام حوسینی دەکرد, فرانس لەپاڵ حکومەتی دیکتاتۆری بەعسدا ژیانێکی شاهانە ژیاوە, وەك خۆی دەڵێت پاسەپۆرتی عێراقی هەبووە بەناوی فارس منصورئەلبەزاز تاوانبار شوێنی حەوانەوەی هەمیشەیی ئۆتێل ڕەشید بووە, ئیتر لەگەڵ رووخانی بەعسدا تاوانبار هەڵاتووەوبەڕیگای سوریاداوبەهۆی باڵوێزخانەی هۆڵنداوە لەدیمەشق بەهاوکاری دەزگای ئاسایشی هۆڵندی کەبە –AIVD_ ناسراوە گەڕاوەتەوە هۆڵندا, لەگەڵ گەڕانەوەوئاشکرابوون و ڕاگەیاندنی ئەم هەواڵەلەمیدیاکانی هۆڵندا,ئێمە *( وەك ناوەندی هەڵەبجە دژبەئەنفال وجینۆسایدی گەلی کوردستان )* بەهاوکاری پارتی سوسیالستی هۆڵندی کەناسراوە بە(SP) هەروەها لەگەڵ چەند ئینساندۆستێکی هۆڵندی کۆمیتەیەکمان بۆئەم ئەرکە پێکهێنا-بەناوی کۆمیتەی بەدادگاگەیاندنی فرانس ڤانئانرات- کەدواتر ناوەکەی *گۆڕا* .بۆکۆمیتەی بەدادگا گەیاندنی تاوانبارانی جینۆسایدی خەڵکی کوردستان, ئیتر ئەم کۆمیتەیە هەرلەگەڵ راگەیاندنیدا کەوتە چەند کارێکی دەست پێکرد لەوانە دابینکردنی پارێزەروخەرجی پارێزەرەکەوکۆکردنەوەی زانیاری ئامادەکردنی دۆسیەیەك لەسەر تاوانبار وئامادەکردنی شایەت وقوربانیەکان, لەشوێنە جیاجیاکانی کوردستانەوە, کەبەرکیمیاباران کەوتوون ولە شوێنەجیاجیاکانی وەك هەڵەبجەوسەردەشت وشاناخسێ و بالیسان وشکات کردنی ڕەسمی لەلایەن پارێزەرەکەمانەوە خاتوو(*لیسبێس ڤان زێخ فێڵد*) لەدادگای هۆڵندا تاوانبارکردنی فرانس بەتاوانی جینۆساید کردن وکۆمەڵکوژی خەڵکی وڵاتەکەمان کەئەمەش گەورەترین تاوانە لەهۆڵندا,هەروەها چەندین کۆڕوچاوپێکەوتنمان لەگەڵ میدیاکاندا سازداوە, نابێت رۆڵی پارتی سۆسیالیست لەیادبکەین کە دۆستێکی نزیکی خەڵکی کوردستانن ولەکۆمیتەکەی ئێمەشدان ولەگەڵ ناوەندی هەڵەبجەشدا پەیوەندییەکی پتەووبەردەوامیان هەیە, پارساڵیش سەردانی کوردستان وشاری هەڵەبجەیان کردبوو, دەوری ئەو پارتە زۆرکاریگەرە چونکە ئەوان هەم خۆی هۆڵندیەو هەم لەپەرلەمانی هۆڵنداش بەشدارن, ئەوان فشارێکی دبلۆماتی زۆریان کردووئەم مەسەلەیان لەپەرلەمانی هۆڵندادا خرۆشاند, لەپەیوەند بەم کێشەیەوە حکومەتی هۆڵندایان ڕوبەڕووی چەندین پرسی گرنگ کردەوە, دیارە ئەمەش بۆئێمەی کورد کەم نیە.

**ئەنفالستان : تاوانبارفرانس ڤان چۆن وکەی دەستگیرکرا؟**

لەرۆژی 7-12-2004دا لەژێر ئەوفشارانەدا هەرلەهۆڵند دەستگیرکرا, ئەوکاتێك دەستگیرکرا کەخەریکی خۆ ئامادەکردن بوو بۆهەڵاتن, پاشان لەلایەن وەزارەتی دادوپۆلیسی هۆڵنداوە دەستگیرکراو هەتا ساتی ئەم چاوپێکەوتنەش لەزینداندایە.

**ئەنفالستان : تائێستا دادگایی کراوە؟ مەبەستم ئەوەیە براوەتە بەردەمی دادوەر؟**

بەڵێ دانیشتنی یەکەمی لەدادگا رۆژی 2005/3/18 لەشاری رۆتەردام بەرێوە چوو,لەودانیشتنەدا دۆسیەی تاوانبار بەشێوەیەکی فەرمی خرایە بەرباس ولێکۆڵینەوە, چەندکەسێك لەقوربانیەکان و ئێمەش وەك ناوەندی هەڵەبجەوپارێزەرەکەشمان ئامادەبووین لەدادگا, پێشتریش بانگەوازی خۆپیشاندانمان کردبوو کەلەبەردەمی دادگا ئامادەبن, بەخۆشحاڵییەوە خەڵکێکی زۆر ئامادەبوون وئەمەش لەمیدیاکانی هۆڵنداوبگرەجیهانیش دەنگی دایەوە, هەرچەندە لەو دانیشتنەدا پارێزەرەکانی تاوانبار دوای ئازادکردنیان کرد, هەروەها داوای سووك کردنی تاوانەکانی‌یان بۆکرد, بەڵام هەم وەزارەت وهەم پارێزەرەکەی ئێمەش دژی ئەم داوایە بوون, دواتریش داوای پارێزەرەکانی تاوانبار ڕەتکرانەوەو لەزینداندامایەوە, ئیستاش چاوەڕوانی دانیشتنەکانی تردەکات.

**ئەنفالستان : کەی دانیشتنی دووەمی دەبەسترێت ؟**

لەوانەیە دانیشتنی تری بەدوادا بێت ولەوانەشە لەکۆتایی ئەمساڵدا دادگا بڕیاری کۆتایی خۆی بدات.

**ئەنفالستان : ئێوە بڕواتان وایە دادگای هۆڵندا بڕیاری پێویست بدات؟**

وەك لەپێشەوە ئاماژەم پێکرد, کردەوەکانی فرانس ڤان گەورەترین تاوانن لەهۆڵندا, بیریشت نەچێ ئەو بە زۆر تاوانی تر تۆمەتبارە, لەوانە هاوکاری دڕندەترین رژێمی سیاسی وەك بەعس , هاوکاری کردن لەجینۆسایدکردنی خەڵکی کوردستان, بەتایبەتی لەهەڵەبجە کە هۆڵندیەکان خۆیان هاتوون بینیویانە بەعس چی کردووە, پێشیلکردنی یاسای نێودەوڵەتی, بازرگانی کردن بەچەك ومەوادی کۆمەڵکوژ, درۆکردن لەگەڵ ئاژانسە نێودەڵەتییەکان لەوکاتەدا کەتیمە پشکنێرەکان لەعێراق سەرگەرمی پشکنین بوون لەساڵی (1990)ئەم درۆی لەگەڵ کردوون, فێڵکردن لەگومرگ وبەندەرەکان, هەڵاتن لەدەست یاساوشتی تریش, هەرئیستا وەزارەتی دادی هۆڵندی خەریکی لێکۆڵینەوەن, لەوڵاتی ئەردەن وعێراق, لەوانەیە بێنە کوردستانیش. داوایان لەئێمەش کردووە کەدوالەحزبە سیاسیەکان بکەین زانیاری پێویستیان بدەنێ, ئێمە لەم بارەیەوە نامەمان بۆ زۆربەی حزبە سیاسیەکانی کوردستان ناردووە,هەروەها داوامان لەوەزارەتەکانی مافی مرۆڤ لەکوردستان وعێراق کردووە کەهاوکاریمان بکەن وزانیاریمان بۆ بنێرن, بەڵام بەداخەوە زۆر بەداخەوە هەتائێستا هیچ وەڵامێکیان نەبووە!!

**ئەنفالستان : ئێوە دەزانن ئەومادەو کەل وپەلە کیمیایی وچەکە قڕکەرانە چین , کە تاوانبار فرانس داونی بە رژێمی سەدام حسێن؟ ئایا هیچی لەسەر ساغ دەبێتەوە؟ ئێوە هیچ بەڵگەیەکتان لەبەردەستدایە؟**

لەسەرەتاوە با ئەوە ڕوونبکەمەوە کەوێڕای تێپەڕینی کاتێکی زۆر بەسەر تراژیدیاکانی هەڵەبجەوئەنفال وهەندێك شوێنی تریش, ئاخر 17ساڵ کەم نیە, بەداخەوە جگە لەلێکۆڵینەوەکانی چەندتیمێکی پزیشکانی بێسنور(اگبا وبلاحدود) لەهەڵەبجەوبادینان وتیمەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان کەلەساڵانی 1980 بۆ 1990 ئەنجامدراوون هیچ لێکۆڵینەوەیەکی تری زانستی وپزیشکی لەسەرئەم چەکەوکاریگەریەکانی لەسەرنەوەی ئیستاودواتروژینگە لەلایەن پسپۆڕانی کورد وعێراقەوە لەبەردەستدانین!! ئەمەش مەترسیدارە, بەڵام ئەوەی زۆر پەیوەندی راستەوخۆی بەپرسیارەکەی ئێوەوە هەیە وئەوەی لەسەر ئەم تاوانبارە ساغ بووەتەوە, دەتوانین بەم جۆرەباسی لیوەبکەین:

/1گازی موستەرد, کەبۆنی سیروپیازی لێدێت, ئەم گازە تێکەڵەیەکە لەدووپێکهاتەی کیمیایی کەبریتن لەمادەدەی – تیۆدیۆگلیکۆل-TdG - وفۆسفۆرئێکسکلۆراید POCL3 کە ئەم تاوانبارە لەکۆی گشتی ئەم دوو گازە کوشندەیە بڕی1960تەنی گەیاندۆتە دەست ڕژێمی عێراق, ئەم بڕەش بەشی قڕکردنی نەك هەر کوردستان بەڵکوبەشی قڕکردنی هەموودانیشتوانی سەرگۆی زەوی دەکات.

/2گازی تابون کەیەکێکەلە گازەکانی تروبەگازی ئەعصاب ناسراوە, ئەمەشیان بۆنی بادەمی لێدێت لەم جۆرەشیان بڕی 60 تەنی داوەبە رژێمی بەعس.

/3گازی سارین ئەمەشیان یەکێکە لەگازەکانی ئەعصاب, بێ بۆن وبێ ڕەنگە لەگەڵ هەڵمژیندا هەموو گیانەوەرێك دەکوژێت, پێکهاتێکە لە لەدوومادەی تر کە فرانس بڕی 136تەنی لەTMPو204تەنیHFی بردووەتە عێراقەوەوبەرژێمی فرۆشتووە.

/4هەروەها گازی ڤی ئێکس-vx- کەگازێکی زۆرکوشندەوترسناکە بۆگەنێکی زۆرناخۆشی هەیەوکەمێك چەورە هەرکە بکەوێت سەرلەش یان لەرێگەی هەناسەدانەوە کوشندەیە, برێکی نادیاریشی لەم گازەداوە بە بەعس.

**ئەنفالستان : ئەوەمان زانی ئەمە لەیاسای هۆڵند گەورەترین تاوانە, ئەی خەڵکی هۆڵند چۆن تەماشای ئەم پیاوە دەکەن؟ تۆ وەك بەرپرسی ئەم دۆزە لەناوەندی هەڵەبجەولەناوکۆمیتەی بەدواداچوونی تاوانباراندا چۆن ئەم مەسەلەیە دەبینی؟**

فرانس ڤان لەهۆڵندە لەدوای تاوانبارانی جەنگی دووەمەوە گەورەترین تاوانبارە, کەدەستی بەکۆمەڵکوژی مرۆڤ پیسە, بەتاوانی جینۆساید تاوانبارەکە تاوانی واگەورەی دەرهەق بەمرۆڤایەتی کردووە, ئیستا لێرە (بەپیاوێك لەمردن)یان بەعەلی کیمیایی هۆڵندی ناسراوە, بەشێوەیەکی گشتی خەڵی ئێرە ئەممەسەلەیە بەنیگەتیڤ دەبینن, بەڵام نابێت ئەوراستیە لەبیر بکەین کە رۆژئاواییەکان بەگشتی قازانج و غۆڵی سەنعەتەکانیان لەبابای رۆژهەڵاتی وەك ئێمەوئەفریقاییەکان بەلاوەگرنگ ترە! بەڵام ئەمە بەهیچ جۆرێك نەچەپەکانیان ونەهۆمانیست (ئینساندۆست) ەکانیشیان ناگرێتەوە, کەهەرئێستا لەگەڵماندا هاوخەمن, بەشداریمان دەکەن, لەگەڵماندا لەکاردان دژ بەم پیاوە تاوانبارە.

**ئەنفالستان : ئەی دادگاکانیان ؟ ئایا ئەوان بەرژەوەندی کۆمپانیاکان لەبەرچاوناگرن؟**

ئەو پرسیارەم پێخۆشە تا شتێك لەبارەی دادگاکانیانەوە بڵێم , ئەوەی زۆر جێگەی خۆشحاڵییە بێلایەنی دادگاکانە لەلەسیاسەت وبەرژەوەندی ئابووری وسامانی نەتەوەیی ئەمە بۆمنیش زانیاریەکی تازەبوو, خۆش بەختانە ئەوتاوانانەی تاوانباری لەسەردادگایی دەکرێت, دیوی دەرەوەی مەسەلەکەتا ئێستا لەبەرژەوەندی ئێمەی قوربانی‌یە واتا لەبەرژەوەندی ئێمەی کیمیابارانکراوو ئەنفالکراودایە, بەڵام نابێت زۆریش بەمە خۆش خەیاڵین !

**ئەنفالستان : پێمخۆشە کەمێك لەدادگای هۆڵندی دووربکەوینەوە, باسی حزبەکانی کوردستانت کرد, ئەوان تاچەند بەتەنگ کێشەکەوە هاتن؟ تەنها حزبە دەسەڵاتدارەکان بەتەنگتانەوە نەهاتن یان هەرهیچیان؟!**

بەداخەوە بێدەخلی ولاموبالاتی هێزوحزبەسیاسیەکانی کوردستان, لەم مەسەلەیەو مەسەلەکانی تریش تەواو مایەی مەترسیە! ئێمە دووساڵە بەو بێتوانایی ئابووری خۆمانەوە, لەسەرحسابی خۆمان شانمان داوەتە بەرئەم ئەرکە, چەندین جارداوای هاوکاری و دۆکۆمێنت وزانیاری زیاترمان کردووە بۆپارێزەرەکەمان و وەزارەتی داد, یان بۆیارمەتی ماددی بۆئەوەی خەجی پارێزەرەکەمانی پێدابین بکەین, بەڵام تائێستا وورتەیان لێنەهاتووە, تەنها یەکی وەڵامی سەلبیشیان نەداوینەتەوە, پێمخۆشە لەم بارەیەوە ئەوەش بڵێم کە هەرئەم حزبانە لەهۆڵندا لەبۆنە حزبیەکانی خۆیاندا ئاهەنگی واسەرسوڕهێنەر دەگێڕن, سفرەی وادەڕازێننەوە کەهەزاران کەسی ڕادەخەن هەریەکەیان هەزارئیرۆی تێدەچێت! بەڵام لەئاست کارێکی لەم جۆرە گرنگەدا کەدەشێت بکرێتە کێشەیەکی میللی گەورەو لەرێگەیەوە داوای زۆر شتبکەین,بەلایەنی کەمەوە قەرەبووکردنەوەی زیان لێکەوتووان یان کەس وکاری قوربانیەکان, لەلایەن ئەوکۆمپانیایانەی چەکیان بەم کابرایە فرۆشتووە یان راستەوخۆ بەعیراقیان فرۆشتووە, هیوادارم سەرەڕای زۆر درەنگ کەوتنیشیان لەمەولا زەحمەتێك وەبەرخۆیان بدەن.

**ئەنفالستان : ئێمە هیچمان نەماوە ماندوومان کردی, ئەگەرتۆ شتێکت مابێ ؟**

منیش سوپاستان دەکەم بۆ ئەم دەرفەتە, دواووتەم ئومێد دەکەم مەسەلەی دادگایی کردنی تاوانبارن ببێتە رێکەیەك وخەڵکی کوردستان وکەس وکاری قوربانیان وهەموو رێکخراوو کەسایەتیە ئازادیخوازەکان لەسەر بەرنامەیەکی تەندرووست کاری بۆبکەن, نەك هەرلێرە بەڵکوولەکوردستانیش تاوانباران بهێننە بەردەمی دادگا, نەك بۆکوشت وبڕین و ئیعدام کردنیان بەڵکو بۆلێپرسینەوەیان لە لایەشاراوەکانی ئەنفال وجینۆسایدکردن.





**فرانس ڤان و عەلی کیمیایی تاوانبار لەچاوەڕوانی دادگادا**



**لیسبێس ڤان زێخ فێڵد**



**پەرلەمانتاری هۆڵندی هاری ڤان بۆمڵ**

# ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ، حوزنی منداڵەکانی ئەنفال بخوێننەوە

## خویندنەوەی پشتی فۆرمەکانی منالآنی ئەنفال چرایەکە بەڕووی تاریکی زەمەندا

ئەمانە. نوسەری ئەو هەستە نەرمونۆڵوخەماوییە خوڵاویانە, عەودالی پارچەکاغەزێکی سپین وەك, دەروونیان, تارۆژە ڕەشەکانی نیوەی دووەمی شتەکانی پیبنوسنەوە...لییان گەڕێن لەهەرکوێ دەیانەوێ بابنوسن, لەسەر دیواری خوێندنگاکان بێ یان لەسەر دیواری ویژدانی ئێمەبێ.

ئەم ئینسانە بەریئانە بەهەر نرخێك بێت دەیانەوێ بنوسن وبپەیڤن و وێنە بکێشن, یان هەندیك جار گۆرانی بڵێن تەنانەت ئەگەر لپشتی فۆرمەکانی سەرژمێرکردنی ئەنفالکراوەکانیشەوە بێت, ئەو فۆرمانەی بەناوو ناونیشانو رۆژوشوێنی گیراوەکان, بەتەمەنو رەگەزوساتی بەسەرچوونیان ریزکراوون, پەوکلێشانەی وەڵامی پرسیارەکانیان پڕن لەئازارو پێشێلکردنوخەم ساردیو بێدەربەستی, بەڵام ئەمان وەڕس بوون لەباسکردنیان, دێنو لەپشتی کلێشەکانەوە بەوەڵامی زۆر سادەو ساکار دەنوسن, وەكوشەرواڵوجانتاودەفتەرەکانیان, وەك( باوکە گیان رۆژانە یادت عەزابی رۆحم ئەدا, ئەی خوایە باوکمیان لەزیندانیکدا خنکاند,

بەهاری رەشی سەرگوڵ رەحیمی 12 ساڵ,
کەنیشکی عازەب عومری 14ساڵ
دیمەنی جوانی وەکو پرتەقاڵ ,
وا(17 ) ساڵە باوکم نەدیوە ) ئەمانەو دەیان نمونەی تری خەونوئارەزووی لەچاڵ نراوی ئەومنداڵانەی وەكومراوی لەسەرچەمی فرمێسکی خۆیان مەلە دەکەنوبەقەد پەروباڵییان, ئارەزووی‌فرین و ئازادیوچاوەڕوانی بەجەستەیاندا لکاوە, ئەومنداڵانەی یان ئەو هەرزەکارانەی خەم بالقی کردوونوحەسرەت چاوبرکێی لەگەڵ کردوونوجەلادیکی عەفلەقی بونیانی تێکداو ئاراستەی پاشەرۆژی ژیانیانی لەخۆرەوەگۆڕین بۆ زیندان.

**عیرفان ئەحمەد**

**بەهاری 2005 / سلێمانی**

## ئەنفال



**تارا عەبدوڵا**

ڕۆژێك لەماڵ دەرچووم بەپرتاو
منداڵێك کوردم بینی لەناکاو

بینیم منداڵێ دەگریا بەکوڵ
پشکۆی ئاگری بەردەدا لە دڵ

ووتم بۆ دەگری ئەی منداڵی کورد
جوابی دامەوە زوو بەدەستوبرد

ئەگەر دەتەوێ دەردم بزانی
گوێم لێرابگرە زۆر بەئاسانی

ووتم گوێ دەگرم وەرە پێم بڵێ
لەسەرچی دەگریو وێڵی ئەم شارەی
دیارە هەژاری یاخود ئاوارەی ؟
بۆ جلەکانت پینەکراوە ؟
لە دووسێ لاوە بەپەت بەستراوە؟

ووتی کاکە گیان گوێ بگرە ئامان
با باسی بکەم بەسەر هات خۆمان

لەبیرم نایا ماڵمان لەگوند بوو
وەك باسی ئەکەن ساڵ هەشتاو هەشت بوو

کەدوژمنی کورد بە درندانە
ئەنفالمانی کرد بۆ ئەوبیابانە
گرمەی تەیارەونالەی تۆپ باران
سەرومانوماڵمان گشت چوو وەتاڵان

هەرلەمنداڵی بەرمەمکانەوە پیروگەنجولاو
ئیستا هەموویان وان ئەنفالکراو
ئەمانەدڵێم لەبیرم نایە, بۆی گێرامەوە هەر هەمووی

## بەهاری ڕەش



**سەرگوڵ ڕەحیم کرم تەمەن 12 ساڵ**

ساڵی هەشتاوحەوت هەتا هەشتاو نۆ
یاخوا بڕوات هیچ کات نەیاتۆ
بەهاری رەشیئەوهەشتاو هەشتە
بۆ قوربەسەری خەڵکی ئەودەشتە
حوکمەت هاوردی قوەی بێ ئامان
بۆ ئەنفالکردن خەڵکی کوردستان
هەڵەمنداڵی بەرمەمکانەوە
بە ئافرەتی سەد ساڵانەوە
لەبراو باوک گشت بێخەوەربوون
لەناو جەیش‌وجاش گشت دەست وەسەربوون.
موستەشارەکان لەگەڵ جاشەکان
شەرەفی گشتیان داوە وەدینار
کەنیشکی عازەب عومری چواردە ساڵ
دیمەنی جوانی وەکو پرتەقاڵ
کەوتنە بەردەستی رژێمی گەماڵ
نازانین ماون یان زیندە بەچاڵ

## ئەنفال



**دیمەن عەبدوڵا مەحمود**

منداڵی کۆڵان پێم دەڵێن هەتیوو
چەندە بەد بەختی باوکی خۆت نەدیوو

دەڵێن بۆچی واباوکت نەماوە
من پێیان دەڵێم ئەنفالکراوە,

دەڵین بۆچی واهەتیوو کەوتی
چی تاوانبارێک ئاوای لێکردی؟

منیش دەڵێم ئەوتاوانبارەی کەوای لێکردم
خۆشی نەبینێ هەتاکوو مردن

لەو رۆژەوەی ئەنفالکراوە
خۆشی لەدڵی من نەبینراوە

هەرکاتێک ناوی ئەنفال دەهێنن
دەڵێی خەنجەرێک بەلەشما دێنن

ئەنفال وانیە لەبیر چێتەوە
لەوەختوناوەخت هەرئەکولێتەوە

لەبیرم ناچێ ئەم کارەساتە
لەهەموو کاتێک هەروا لەیادە.

## بسم الرحمن الحيم

دایەگیان باوکم بۆ کوێ رۆیشتووە,
منوتۆی لێرە بەجێهێشتووە,
وا (17) ساڵە باوکم نەدیوە,
لەگەڵ ئەوەشدا یەکمان ناسیوە
کاک هەڵۆ ووتی باوکت لەکارە دەگەرێتەوە
دەمەو ئێوارە نانو چیرۆکت بۆدێنێتەوە
من منالێکی ناوچەی گەرمیانم
خۆم فیدا ئەکەم بۆکوردستانم
بەم منداڵییەوە خەفەتم زۆرە
باوکم ئەنفالی دەست دیکتاتۆرە
ئەزانم بێناز بەخێوکراوم
لەتاریکیدا هەڵهاتووە چاووم,
ئەڵێم بەبەعسی مەلعونی غەددار
کوا گۆری سەوهەشتاودوو هەزار ئەنفال.



**نەرمین ساڵح عەزیز**
**تەمەن 16 ساڵ**

## ئەی خوا

ئەی خوا لەچی زیندانیکدا
جەلادەکان باوکمیان
خنکاند ؟
چۆن هاوری منداڵێك
نەگەیشتە لاتان
ئەی لێ لێیە وەی لۆ لۆیە,
ئەرێ ئەنفالەکانمان لەکوێیە؟
ئەی خوا هاوارمان بۆلاتان
, لەیاد مەکەن
هەڵەبجەمانهیرۆشیماکەی
کوردستان , سەوهەشتاوودوو
ئینسان؟
پێنج هەزاری لەهەڵەبجەو
دەهەزاری لەبادینان, ئەوەی تری
لەگوندەکان, هەمووی
کوژرانوفەوتینران.ئەی
خوایەگیان ئەنفالکران,
سویندبێ بەحەسەن
کویستانی, بەمامەڕیشەی
گەرمیانی
وازلەئەنفالمان ناهێنین,
تۆڵەی بابامان دەسێنین,
نوسراوە لەسەرمەچەکمان
یان کوردستان یاخود
نەمان.

**بێخاڵ ڕەشید سەعید**

## باوکە گیان



ئەی باوکە گیان بۆ منت بێ نازو بێ لانەکرد
منت رەنجە رۆی دەستی زۆر دارکرد
ژیانی من دوای تۆ تەنها حەسرەت و گریانە

**سوعاد عەلی حسێن**

دڵنیام کە دۆزەخێکە ئەم سوتێنێ بێ باکانە
باوکە گیان رۆژانە یادت عەزابی رۆحم ئەدا
دایم خەیاڵ بەرەو تەمەنی منالیم ئەبا
بۆ ئەوەی زیاتر بزانم کەتۆم هەبوو
ئەو کاتە ژیانم لە تەمەنێکی نە فا میدا بوو
بەڵام نازانم شێوەت چۆنە تەنها بەخەو نەبێ
خۆشت ئەزانی من منال بوم ئێستا نازی تۆشم ئەوێ
باوکە گیان تۆ ناتوانی وەڵامی ئەم پرسیارانەم بەیتەوە
لە وانیە تۆخەوتبی قەت خەبەرت نەبێتەوە
خۆزگە ئەو خەوەی تۆ لە چاوی من بکەوتایە
لە بەر ئەوەی لەدوای تۆ ژیانم سەرف نەکردایە.

# من کەسم ئەنفال نەکراوە, بەڵام کەرامەتم ئەنفالە

سەرنوسەر

ساڵی پارکە سەرقاڵی دەرچوونی ئەنفالستان بووم , دۆستێکم لە رووی دڵسۆزیەوە لێم هاتە پێشەوەو پێی ووتم بۆچی خۆت تووشی کێشە دەکەیت ؟ ئەوانەی کەس‌وکاریان ئەنفالکراوە لەهەموو کەس بێدەنگترن‌وئەوانەی خەڵکیشیان ئەنفالکردووە, هەزاران جارلەمن‌وتۆوپێشمەرگەئازاکانی دوێنێ لەپێشترن, وەکجاران لێدەخورن‌و پاسەوانیان بەدواوەیەو دیوەخانەکانیان لەجاران گەرمترەو نەسریەی دیوەخانانەشیان خەیاڵیە, کەلەلایەن هەردوو حکومەتی کوردیەوە بۆیان دابینکراوە, پرسەو شاییان خۆشی‌وناخۆشییان لە شاشەی تەلەفزیونەکانەوە پەخش دەکرێ‌وکەس‌وکاری ئەنفالکراوەکانیش وا لەبرسان دەمرن,کاکە دانیشە دەست بەکڵاوەکەی خۆتەوە بگرە باتۆش ئەنفال نەکەن,بەخوا سبەینێ منداڵەکانیشت چارەنوسیان لەتۆ باشتر نابێت, منیش وەك چۆن لەسەرخۆ گوێم بۆگرتبوو,هەروا لەسەرخۆش سوپاسم کردو وەڵامم دایەوە: ئەوەی ئێستا پێت ووتم بەزیادەوە هەمووی دەزانم, لەوەشدا ڕاست دەکەیت کە من کەسم ئەنفال نەکراوە بەڵام بیرت نەچێت ئێمە هەموومان کەرامەتمان ئەنفالکراوە, ئینسانیەتمان سووکایەتی پێکراوە, بەڵام ئیدی وەختی ئەوەیە چیدی ڕێگە نەدەین ئەنفال بکرێینەوە, من هەتا ئەمڕۆ ئینسانیەتی خۆم نەدۆڕاندووە ڕێگەش نادەم بیدۆڕێنم, ئەو ئەنفالچیەکوردەی دوێنێ بەشداری کردەی ئەنفالی کردووەو پەلی کچەکوردێکی گرتووەو تەسلیمی سوپای کردووە, ئەوەی بەناوی پەنا دان‌و لێبوردنی گشتیەوە خەڵکی هەڵخەڵەتاندووەوپاشان داویتیە دەست بەعسەوە, تەنانەت ئەوانەی ئەمەشیان نەکردووە, بەڵام بەپێش چاویەوە ئەوهەموو بێحورمەتیە بە ئینسان کراوە, ئەوەهێشتا بەرلێبوردنی خەڵك نەکەوتووە, بەرلێبوردنی حزبەکان کەوتووە, بیرت نەچێت لێبوردنی حزب‌ولێبوردنی کۆمەڵگا جیاوازیان زۆرە,حزب نوێنەری خۆیەتی‌ئەوحزبانەی‌کەهیچ خەمێکی ژیانی خەڵکیان لەبەرنیە چۆن دەتوانن نوێنەری بن؟ تاوانباران نەهاتوون داوای لیبوردن لە خەڵکی کوردستان بکەن, چونەتە بن باڵی حزبەکان, ئەوانەشی ئەمڕۆ لەرۆژنامەو تەلەفزیونەکانەوە خەریکی کەش‌وفشی کوردایەتین, گوایە پەیوەندی ژێربەژێریان لەگەڵ ئەم حزب یان ئەو حزبدا هەبووە, درۆدەکەن‌و ناتوانن بەو ئاسانیەو بەتەسریحی سەرکردەیەك ئەوتاوانە لەکۆڵ خۆیان بکەنەوە, ڕەنگە موستەشار هەبوبێت پێشمەرگەی داڵدەدابێ‌و ژیانی ئینسانێك یان دوانی سەندبێتەوە, بەڵام بیرت نەچێت ئەوان ئەوەیان لەرووی ئینسانیەتەوە بۆ حساب ناکرێ, چونکە لەبەر زەبری بەسەبری پێشمەرگە لەلایەك‌و لەبەرئەوەی دەیانزانی ئەگەر پێشمەرگە لەکوردستان نەمێنی بەعس نەك هەرچەك‌وجلیان دەکات, بەڵکو دورنیە ئەنفالیشیان نەکات, ئاخر کەسێك پیاوماقوڵێك موستەشارێك قبوڵی ئەوەبکات بەشداری کوشتن‌وئەتك کردن‌وبێسەروشوێنکردنی ئەوهەموو مرۆڤە, ئەوهەموو هاونیشتمانیەی خۆی‌و هاونەتەوەی خۆی بکات, چۆن دەبێتە جێگەی متمانەی هێزێکی حوکمڕان؟ چۆن دەبێتەجێگە متمانەی بەعس, کەم نەبوون ئەوجاسووس‌وجاش‌و موستەشارانەی لەلایەن ئەفسەرێکی عەرەبەوە یان لەلایەن دەست رۆیشتوویەکی بەعسەوە سووکایەتیان پێکراوەو پێیان ووتراوە ئێوە وەفاتان بۆ کچەکانی خۆتان نەبێت وەفاتان بۆحکومەتی عەرەبی نابێت, کەم نەبوون ئەوانەی بەوپەڕی سووکایەتی پێکردنەوە وەك کاسیحەی ئەڵغام لەلایەن ئەفسەرێك بگرە عەریفێکیشەوە پێشخۆدراون‌و شەڕی پێشمەرگەیان پێکردوون, ئەی ئەوانە ئەگەرهەموویان هەر پیاوی ڕەشیدو هاوکاری پێشمەرگە بوون؟ ئەی ئەوکەمینە زۆر خراپەیان لەکام زیندانی حکومەتەکانی کورددایە؟ من هەمیشە ئەو قسەیەی موستەشارێکی ناچەی سووورداشم لەبیرناچێتەوە کە ووتبووی:( ئێمە هەق وایە نانێك بخۆین‌و یەکێکیش بنێرین بۆ سەرگەڵو, چونکە ئێمە نانی پێشمەرگە دەخۆین, ئاخر ئەگەر پێشمەرگە نەبێ‌و چالاکیەکانی ئەوان نەبێت, سەدام سەگ‌وگورگی وەك, ئێمەی بۆچییە, مەگەر پارەی لێزیادە؟) بەڵام ئەوانەی ئەمڕۆ فەزڵ فرۆشی بەسەر خەڵکەوە دەکەن‌و دەڵێن خەڵکمان رزگار کردووە, فەرموون ئەوە دەزگاکانی ڕاگەیاندن, بابێن‌و بفەرموون, شایەتحاڵەکان بێنن‌و شاهیدی ئەوەیان بۆبدەن کەفلان موستەشار لەدەست دێوەزمەی‌ئەنفال رزگاری کردووە؟! فەرموون باخەڵکیش دڵی پاکببێتەوەو بزانن ئەوانەی پەیوەندی ژێر بەژێریان لەگەڵ حزبەکان هەبووەو ئەوێ ڕۆژێ مەردایەتیان نواندووە, بەڵام مەحاڵە خۆری ڕاستیەکان بەبێژنگی حزبەکان بگیرێ, ئەوانە پیاوی بەعس بوون‌وئەمڕۆ فەزڵفرۆشی مەردایەتی دەکەن, چەندیان هاتوون بڵێن ئەوپارەیەی بە خۆفرۆشی پەیدامکرد , ئەوپەڕی شەرمەزاریە, من دەیگێڕمەوە بۆخزمەتی ئەوانەی بوونە قوربانی؟ حزبەکان لەگرانی‌وڕۆژە سەختەکانی گەمارۆی ئابووریدا, چەند تاوانباریان ناچارکردووە, بەشێکی کەم لە سەروەت‌وسامانیان بخەنە خزمەتی ئاوەدانکردنەوەوبژێوی پیرە پیاوو پیرە ژن‌ومنداڵی پاشماوەی ئەنفالەکانەوە؟ ئەی ئەگەر پرسیارەکە ئاوەژووبکەینەوەوبپرسین: چەند کۆمپانیاهەیە هیی ئەوانە نەبێت کە خوێنی مرۆڤێك‌وپشیلەیەکیان لاوەك یەك وایە, ئەگەر ئەوانەی ئەمڕۆ داکۆکی لە ئەنفالچیەکان دەکەن, دەبێت بۆهەتاهەتایە گوێ لەقسەی ئەومنداڵەی ئۆردوگای شۆڕش بخەوێنن کەدەڵێت: ( یەك دەست جلم هەیە, ئەویش هی خۆم نیە هی‌قوتابخانەیە! ) ئەی بەرپرسێك دەڵێت چی سێتێك سەیارەم هەیە ئەویش هی حزب نیە هی خۆمە؟ نازانم بۆهەتاهەتایە بەرپرسەکان دەتوانن خۆیان لەو شەرمەزارییەگەورەیەبدزنەوە یان نا, کاتێك قسەی ئەومنداڵەدەبیستنەوە کە لەوەڵامی پرسیاری رۆژنامەیەکدا وتبووی: دەزانم کێ باوکمی ئەنفال کردووە, بەڵام ناوێرم قسەبکەم! بەڵام هەرگیزناتوانن خۆیان لەوترسە رزگاربکەن, کەمنداڵێکی 14 ساڵان لەوەڵامی رۆژنامەنوسێکدا دەڵێت :دەمەوێت خوێندن تەواوبکەم‌ودوارۆژ ببم بەحاکم, بۆئەوەی تاوانبارانی ئەنفال بدەم بەدادگا.

## لەگەورەترین شاری کوردستاندا نازانرێ کارەساتی ئەنفال چییە ؟!

سالارمەحمود

بەپێچەوانەی ئەو بۆچونەوە کەدەیبیستین‌ودەوترێ ! ئیتر بەسە بەکوردی قسەکردن‌و شیکردنەوەولێکۆڵینەوە لەسەر کارەساتی ئەنفال‌ودوراییەکانی بۆناساندنی,یان دەوترێت لەجیاتی ئەوەی بەکوردی خۆماندوبکەین‌وزۆرترین تواناکان بەوئەدەبیات‌وزمانەوەبەخەرج بدەین, باشتروایە بەزمانە بیانیەکان تێهەڵچینەوەوبەوردی‌وبەڕیتمی زانستیانە, حەقیقەتە مێژووی‌وکردەواقیعیەکەی بخەینە بەرچاو وبیگەیەنین بەدەرەوەی خۆمان, ئەم بۆچوونە بەدیوێکیدا زۆرێك لەڕاستی‌وزەرووەتی تێدایە, کەزۆر پێویستە لەزمانێك زیاتر کەڵك لەکەناڵ‌وشێوازی ڕوناکبیری‌وهونەری‌وئەدەبیەوە لەچوارچێوەیەکی زانستیانەی پەتی‌دا کار لەسەر ئەو مەسەلە تراژیدیا گەورەیە بکرێت, بەڵام بەدیوەکەی تردا بێ ئاگاییە ئەگەر پێمان وابێت, بەکوردی نوسین‌و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەنفال‌و کارەساتەکان جێگەیەکی ئەووتۆ ناگرێت, یان کاریگەری دروست ناکات, بەپێچەوانەوە ئێمە هێشتا لە ئاستی پێویستدا وەکوکورد بایەخ‌وگرنگیمان بەو کۆستەنەداوە, چ لەئاستی میللی‌وچ لەئاستی دەسەڵات‌وحکومەتیشدا, واتە هێشتا لە زۆر لایەنەوە بێباکییەکی مەترسیدار لەوبارەیەوە هەست پێدەکەین, دیارە ئەو بێباکییەش بۆخۆی هەڵگری چەند دەلالەتێکی مەترسیدارە, بەتایبەتی لەناو ئەو دام‌و دەزگاحکومیانەی ڕاستەوخۆ پەیوەستن بەمەسەلەی ئەنفال‌وکەسوکاریانەوە..

هەرلەبەر ئەوەشە نیگەرانی کەس‌وکاری ئەنفالکراوەکان تا حاڵی حازر نەڕەویوەتەوەو لە چاوەڕوانیەکی پڕلە مەینەتیدادەبن,ئەوان تێگەیشتوون لەوەی کە ئازیزانیان بەزیندوویی بران‌و نەمان, بەڵام خۆئێسك‌وپروسکیان ماوە؟ گەربۆ سەبوریش بێت خەڵکەکە هەرچاوەڕوانی هێنانەوەیانن, کەدەبینین لەهێنانەوەی ڕوفاتەکاندا هیچ هەوڵێکی جدی بەدیناکرێت, لەوە تێدەگەن کە دەسەڵات لەگەڵ خەمەکانیاندانیە, لەهەستەکانیانەوە نزیکنین, ئەمەش سەرچاوەی‌بەشێکی‌مەینەتەکانیانە, لەبارەی ناساندن‌و نەناساندنی مەسەلەی ئەنفالیشەوە یاخود تێگەیشتن‌و قوڵبوونەوە لەوبارەیەوە کوردودەسەڵاتەکەی ئەرکێکی هەمەلایەنەی گەورەی لەسەرشانە, ئەویش داخڵ کردنی ئەو کارەساتەیە لەنێومەسەلە سیاسیە زیندووەکانی خۆی بە بەردەوامی ئیشی لەسەربکات, لەڕوی پەروەردەیی‌و خوێندنەشەوە ڕەنگدانەوەی تراژیدیاکانی (ئەنفال‌وکیمیاباران) لەدوو توێی پرۆگرامەکانی خوێندندا وەکو سەرچاوەیەکی باشی کارەساتی مێژوویی‌وکۆمەڵکوژی مرۆڤایەتی لەم دەڤەرە, کاری لەسەربکرێ‌و بکرێتە پرسیارێکی زیندوو لەئەخلاقیاتی نەوەکانماندا.

هەروەها ئێمە دەشێت ئەوڕاستیە بزانین کەلەناوکورد زمان‌و نەتەوەی خۆماندا وەکو کوردستانی سووریاو ئێران‌و تورکیا نەمانتوانیوە ئەو دەقەبشکێنین, هەرهیچ نەبێ لەڕووی فەرهەنگی‌و ڕوناکبیریەوە سنوری ئەو لەمپەرانە بشکێنین, من لەم ڕووەوە تەنها نمونەیەکی زیندوو دەگێڕمەوە کە ئەمەش ڕوویداوەو هەرئەمەش بووە سەرچاوەی ئەم نوسینە, ئەویش لەڕێگەی سەفەرێکمەوە بۆ ئێران, چوومە شاری گەورەی کوردستانی ئێران( شاری کرماشان) دوای ووردبوونەوەیەکی زۆر لەهەڵسووکەوت‌وزمان‌وساختمان‌وشوێنەکانی تری شارەکەو خەڵکەکەی چەندین کتێبخانەو شوێنی کتێب فرۆشتن گەڕام لەگەورەترین کتێبخانەدا کە کتێبخانەی (حافڤ)بوو, لەنهۆمی دووەمی ساختمانێکدابوو, سۆراخی کتێبی کوردیم کرد, لەبارەی هەر سەرچاوەو کتێبێك کەلەسەر, کوردوتراژیدیاکانی ئەنفال‌وکیمیابارانکردنی کوردی عێراق پرسیارم کرد.. سەرەتا رووی دەمم کردە کوڕێکی گەنج ئەویش لەکتێبخانە گەورەیەدا ئاماژەی بەوەکرد بۆ ڕەفەیەکی بچوکی کتێبخانەکەو بەزمانی فارسی پێی ووتم (ئەوانە کتێبی کوردین) کەتەماشام کرد لە پانزە زیاتر نەبوون, ئەوانیش هەموویان بابەتی ئەدەبی‌ودیوانی مەولەوی‌و یەك دووباسێك بوون لەسەر باباتاهیری هەمەدانی‌و جوگرافیای هەورامان‌وزمانی‌لوڕی‌وباسێکی سدیق بۆرەکەیی بوون, پاشان چوومە لای کوڕە گەنجەکەوپێمگووت: باشە هیچ سەرچاوەو کتێبێك شك نابەن لەسەر ئەنفال ؟بەسەرسوڕمانەوە وەڵامی دامەوە ئەنفال چییە؟ دیسان پرسیارەکەم بەنەختێك ڕوونکردنەوەوە دوبارەکردەوە, بەڵام ئەو پێی ووتم شتێکم لەبارەی ئەو مەسەلەیەوەبەرچاونەکەوتووە, کەبەوردی لەبارەی بارووذۆخی ئیستاو ڕابووردوی کوردستانی عێراقەوە قسەم لەگەڵ کرد, ووتی ئەوە باوکمەوچل ساڵێك دەبێت ئەم کتێبخانەی کردۆتەوە پرسیارلەو بکە لەوانەیە شتێکی لیبزانێت, بەڵام کەچوومەلای ئەویش کەلەسوچێکی دورتری کتێبخانەکە ڕاوەستابوو, بەکوردی سلاوم لێکردوو بەفارسی وەڵامی دامەوە, دیسان بەکوردی پرسیاری کتێبم لێکرد لەبارەی سەرچاوەی ئەنفالەوە بەکوردیەکی پڕلە ووشەی فارسی وەڵامی دامەوە, بەڵام وەڵامی کوڕەکەی زۆر باشتربوولەهی خۆی .. چونکە بۆکوڕێکی تەمەن سی ساڵان لەوانەیە نیگەرانییەکەی کەمتر بێت, لەبەرئەوەی کاتێك کارەساتی ئەنفال ڕوویداوە تەمەنی ئەو شانزە تاحەڤدە ساڵانبووە, بەڵام بۆپیاوێکی قاتووپانتۆڵ لەبەری تەمەن پەنجا ساڵی سەرماش‌وبرنجی, خاوەنی کتێبخانەو خوێندەوار ئەو پەڕی نیگەرانی بوو بۆمن, کەکەوتینە قسەو پرسیارکردن لەیەکتری شتێکم لەسەر شاڵاوی ئەنفالی ساڵی 1988 وڕاگواستن‌وزیندە بەچاڵکردنی کوردەکانی کوردستانی عێراق بۆگێڕایەوە بەدەستی صدام‌و ڕژێمەکەی .

لەوسەفەرەی شاری کرماشانمداولەخوێندنەوەم بۆ ئەوگفتوو گۆیەوگەڕان بە کتێبخانەکاندا, گەیشتمە سەرئەو بڕوایەی بەڵێ ئەو شارە گەورەیە بێخەبەرن لەکارەساتی ئەنفال کەئەو شارە گەورەیەش بێئاگان لەو کۆستە واتە بەشێکی کورد هێشتا لەترژیدیا پڕلە مەترسیەکانی نەتەوەی خۆیان بێخەبەرن, ئەم بێ ئاگایی بوونەش هەڵگری چەند مانایەکە بۆ ڕادەوچەندێتی بوونی ئینتمای نەتەوەیی‌وهوشیاری لەبەرانبەر مەسەلە چارەنوسازەکان.

## ئەرکی پەرلەمان‌و دادگاکانی کوردستانە

شەماڵ محەمەد

ئەگەرچی حزبەکوردستانیەکان بەرەی کوردستانی لەهەل‌ومەرجێکی تایبەت‌وسەرەتای ڕاپەریندا لەتاوانبارنی ئەنفال خۆش بوون, بەڵام ئیتر ئێستا لەپاش روخانی بەعس‌و هاتنەکایەی هەل‌ومەرجێکی جیاواز لەچاو ئەو سەروەختە, هەق وایە ئیتر دادگاکانی حکومەتی هەرێمی‌کوردستان لەڕووی یاساییەوە پێداچوونەوەیەك بە مەلەفی تاوانباراندا بکەنەوەو ئەوەی کەتا ئێستا بەشاراوەیی لەمەڕ ئەنفال‌وچارەنووسی ئەنفالەکانەوە ماوەتەوە, ئیدی بتوانێ کلیلی دەرگا داخراوەکان بەدەستەوە بگرێ‌ولەڕێگەی دوواندن‌وبەقسەهێنانی ئەوانەی بەشداری ئەوتاوانانەیان کردووە تیشکێك بخەینە سەرتەم‌ومژوولایەنە تاریك‌وشاراوەکانی کارەساتەکە, ئیدی ئەرکی دادگایە لیبوردنی سیاسی حزبەکان‌و لێبوردنی ئەخلاقی لێك جودابکاتەوە, ئەمڕۆ دادگاکانی هەرێمی کوردستان دەتوانن لەڕێگەی مافی گشتی کۆمەڵایەتیەوەوبەپشتیوانی ڕێکخراوی مافی مرۆڤ ئەنفالچیەکان بهێننە قسە. چونکەمافی گشتی (حق العام) مافێکی زۆر سەرەتایی کۆمەڵانی خەڵکە کە ئەم داوایە ڕووبەرووی دادگا بکەنەوەو تاوانباران بێن‌و حیکایەتەکانی ئەو زووڵمەمان بۆ بگێڕنەوە, پێمان بڵێن خۆیان چۆن تێوەگلان‌و خەڵکیان چۆن کۆدەکردەوەو چۆن هەڵخەڵەتاون‌و ئەمانیش چۆن خەڵکیان هەڵخەڵەتاندووەو ڕاپێچی مەرگیانکردوون, مەرگێك تاکوو ئەمرۆش کەس نازانێ چۆن‌و لەکوێ بەڕێوە چوو؟ هەروەها دادگای عێراقیش هەق وایە ئەو مافەی خەڵکی کوردستان پێشێل نەکاو لەتاوانباران بپێچێتەوەو بەتایبەتی گەورە تاوانباری جینۆساید (عەلی کیمیایی) کەهێشتا لەژیاندا ماوەو لەبەردەستی داداگادایە, دەتوانرێت لانی کەمی زانیاریەکانی پێ ئاشکرابکرێن.

# مەزنترین وەحشیەت
# دنا ڤ کەلها (سەلامیێ)دا د دەرحەقا ژنکا دا دهاتە ئەنجام دان

**ئەڤ چیرۆکا ژکتیبا ئەنفالا بەهدینان وەرگرتیە ژنڤیسینا (عەلی بەندی) کا چا (عەزیزە جەرجیس عەبدللە) باسی حالی خۆدکەت ژرۆژا ئەنفالیو ژبندەستێن جەندرمێن بەعسییادا**

دەڤەرا بەرێ گارەی ئیك ژوان دەڤەرابوو یێن ب بەر مەزنترین هەوین ئەنفالا (1988)ێکەفتیو مەزنترین تاوان دەرهەقێ خەلکی دەڤەری دا هاتینە ئەنجام دان.

ل هاڤینا 1988ئیڤارێکا درەنگ,خەلکی گوندی مە (سپیندارا خەلفو)ب عەرزوعەیال ڤەل قەسیلا پەری گوندی خرڤەبونوهەمییا چارەنڤیسێ خو کرە ئیك کوژیکڤە نەبن, مانونەمانا وان ب هەڤرابن, دوان دەمادا(محسنێ سالحێ سافیاییێ) هەنارتە گوندی مەوگووت ب زویترن دەم گوندی بەردەنوکەس نەمینیتە تیدا,وژووردا ب خار بکەڤن ئەم یێ ل هیڤیا وە دا دەرباز بین هێشتا ئەم نەکەفتینە ناڤ دەست ولەپین دوژمنی ,زەلامەك دگەل مەدا هەبو دگوتنێ (غازی شێکی) جلکێ پیشمەرگا ل بەربوون,مال مال گەریاوگوت رژیمێ لیبوردنیدای دا خوب ئامیدیێ رابگەهینین وڤێ دەلیڤی ژ دەست نەدەین,هوسا کابرا ب بناڤ کولانا دهاتودچو ب خەلکی ڤە دما دا کەس کەس دەربازی سنورا نەبیت ,شەڤ تاریستانە ,تبل چاڤە ,ئەم ژگوندی ب گریوزوندك ڤە بخار کەفتینوگەهشتینە سەر سبەی دا دەرباز بینوبگەهینە بابێ محمدی ,مخابن هەمی لەمە هاتنە گرتنوئەم ژهەمی لاڤە دورپێچ بووین نەچار بووین مە گوتە وان ئەم یێن هاتین مە قەستا لیبوریینیا کریوخوتەسلیم بکەین ,ئەم هەمی ریز کریو پاشی وەکی پەزی راتەڤاندی راهاڤیتینە دبوودیین ئوتومبیلا داوئینانە(کانێ) ل ویرێ ئەم گیرۆ نەبووین ئیکسەر ڤەگۆهاستینە ئامێدیێل وێری مەدیت زەلام ژمەجوودا کرنودانە لایەکی وپیش چاڤین مە هلاڤێتنە بەر,ل ویرێ مە دیت (غازی شێخکی)ئەوی ل گوندی مە مال بەمال گەریای یێ راپیچایە چەكوساجوورێن وی ب ملێ ڤەنە ودناڤ مەدا هەرێتێتودچیت وییێبمە دکەنیو تەرانین خۆ بمە دکەت ,مەژنوی زانی کو کابرایێ خائینە ودوێڤەلانکێ بەعیسانە ئەوی ئەم مژول دکرینو ئێخستینە دڤی توریدا.

هوسا جحیلێن دەڤەرا بەرێ گارەی دانە رەخەکیوئەڤ حەشاماتێ مرۆڤا تێهنیوبرسی ستوییێ وان ب سەرملادا خویل ببون, ل بەروێ تەعرە تاڤێ, رۆژا پاشتر سپێدێ زیلێن لەشکری ئینانوپێشمەرگەوجحێلێن دەڤەرێ دەستێن وان ب شویتکێن وان ڤەگرێدانوزەلامێن سەرەژی جوداکرن, هوسا ئەم هەمی لە ئوتومبیلا سیارکرن وەکی هوڤا بەرێ مەدا دهوکێ, گەهاندینەقەدشێ کولان کولان ئەم گێراندین, خەلك بخورتی ئینیان پێشیامە, ل سەرسنگێ ژی وەکی فلیمێ سینەماییێ ب کولانا دا گێراندینو خەلك بەچاڤێ گریی بەرێ خۆ ددنە مە, وار وارا زاروكوبچویکێن مەیە دڤان زیلادا, بڤێ رەنگی ئەم گەهاندینە دهۆکێ وداگرینە دکەلها نزارکێ دا, هەر دگەل گەهیشتنا مە هەرچوار پێنج سیخور دابەزنە گەنجەکیو ل بەژنا وی پالەبن وبەرسینگێن وان گرنو پشتوپشت دا ل دیوارەکی دەن وسەرێ وان ب دیوارەکی ڤەهیلن, پرچکێن خوێن مەژی ب دەڤ و دفنا دا دهاتە خوار , هەوار هەوارا مە بچوکێن مە بەعەجاندن, ددەلیڤەکێ دا من سەرێ خۆچەماند دا وان دیمەنێن هوڤانە نەبینم من هند دیت حەیزەرانەك ب ناڤ ملێن من کەفتو من ئاگەهـ ژ خۆ نەما, من هند زانی کو کەزیێن من یێ دناڤ دەستێ هندەکادا ویێ من ل سەرپشتێ دخرینن, ئەڤ گەنجە سەروسەر یێ ب ڤێ دیواری دکەڤن وب پێدی ڤە پەچریمە دکەن دەستو پێ لێ شکاندنو هاڤێتنە دسندوقێن پشتی ترومبیلادا, بەزنە هندەکێن دیو کەرێن بلوکاڤەوەشاندنە سەرێ وانو شەق شەقکرنوخیزە دەکرە ناڤ برینادا و گەلەکا گیانێ خۆ ژدەست دان, مەکرە هەواروڤیژیوبەخت بەختا مەیە, ئینا ل مەزڤرینوقەستا ناڤ ژنکا کرکورتەکێن مەب دەستێن پیسوکوری ژبەر ئێمەدا ئینان خواریو گەلەك کچێن گەنج هێلانەب تەنکاکراسیوسەرکولکرن, پێش چاڤێن زەلاما دەستێ خو درێژ دکرە کچوژنان, ناڤ پاخلێن وان پشتی چەند رۆژێن رەشوتەعل مەل ڤێ کەلهێ ب رەزالەتێ بوراندین, زیلێن لەشکری ئینان ئەم ژنكوعەرزوعەیال زیلا سیارکرینو مە نەزانی دێ مە کیڤە بەن, ژ دهۆکێ ئەم درکەفتین قارا قارا زاروکێن مەیە, ژبرسادا, دەیکێن رەبەن هشكوزوها ببونوئاگەهـ ژبچوکێن خۆنینە, ب وان برینا ڤەبەرێ مەدا بازێرێ مویسلێ وبەرێ مە کەفتە دەشتەکێ پاشی ئەم کرینە دسەربازگەهەکێ ڤە دەگوتنێ (سەلامیێ) جهێ ئێخسیرێن ئێرانی بوو, هەربەرێ سپێدێ دا ب قووتانێ مە ژخەو هشیار کەن وب بوستالاو حەیزەرانا ل تەنیشتێن ژنکا راوەستن, دابێژن ما ئەڤە ئوتێلە هوین خو درێژ دکەن, دا چاڤ کەنە کچێن جوانونەشویکری ژمە جودا کەن, پرچێن وان رادکیشانو دڤیا ئێکێ دەنگ ژخۆ نەئینابا, پا چاڤ کربایێ دگەل خۆ دبر, رۆژەکێ کچەکا جوان ولایەق دگوتنێ (پوریێ) نوکە ژی بویە دەیكوهەر هەیام هەیام ئەز دبینم, دەلیڤەکێ دەرگەهێ هۆلا مە ڤەبوو, ئینا پوریێ قەستا من کرو گووت خالەت بۆ خاترا خودێ کا کوریێ خۆ بدەف من دابکەمە دکۆشا خۆدا تا ئەڤ بەرازە ژناڤ مە دەرکەڤن دا هزربکەن ئەز ژی دایکم, بەلکی بڤێ ریکی بەلا خو ژمن ڤەکەنو بێمە پاراستن, هوسا نەخۆشترین رۆژ دژیان مەدا مە ل سەلامیێ بوراندن, مەزنترین وەحشیەت دنا ڤ کەلها سەلامیێ دا ددەرحەقی ژنکا دا دهاتە ئەنجام دان, هوسا 18 رۆژ مە بڤی حالی بوراندن و ئەم ڤەگوهاستینە دناڤ ستری مەشکێن جەژنەکان دا.

## مێژوویەکی سپی و وەزیرێکی بێ تاوان!

**رزگار عومەر**



هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار لە کوردستان ، لە بەرامبەر هەوڵەکانی دادگایی کردنی (نەزار خەزرەجی ) و (وەفیق سامەرایی) هاتنە وەڵام و ڕۆڵیان هەبوو لەوەی کە وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەربچن و نەجاتیان بێ لە دادگایی کردنیان لە تاوانی جینۆساید کردنی کورد ، بەمەش نەوەستان پاکانەیان بۆ (سوڵتان هاشم ) ی وەزیری بەرگریش کردو بە شەریکی لە گەڵ ئەمریکا بەڵێنیان بە عەشیرەتەکەیان دابوو کە سوڵتان هاشم تەنیا بە حوکمی پلەو پایە سەربازیەکەی دەگیرێ ، ئێمەش لێرە بۆ ئاشنا کردنی زیاتری خوێنەران بە ڕابردووی سپی ئەم وەزیرە پەپولەیە ، ئەم بەڵگە نامەیە دووبارە بڵاو دەکەینەوە ، کە بریتییە لە بروسکەی پیرۆز بایی وەزیری ناوبراو بۆ سەدام حوسێن، بە بۆنەی سەرکەوتنی یەکجارەکی لە هێرشەکانی ئەنفالدا ، ئەمە پیرۆزبایی وەزیری ناوبراوە کە لە هەموو ڕۆژنامەکانی ڕژێمی بەعس لە ڕۆژی 19ئاداری 1988 بڵاوبۆتەوە.شایانی باسە هەر لەم بروسکەی پیرۆزباییە وەزیری ناوبراو ئاماژە بە ڕۆڵی جاشە کوردەکان دەکا لە سەرکەوتنی یەکجارەکی ئەم هێرشانە ، ئەمڕۆ ئەم جاشانە زۆربەیان شۆڕشگێڕو دەسەڵات بە دەستی نێو هەردوو حیزبی دەسەڵاتدارن کەس ناتوانێ لە گوڵ کاڵتریان پێ بڵێ .

# ئەنفال و هەڵمەتی گەشەپێدانی ناوچەی باکور لەبەڵگەنامەکانی بەعسدا!

**ئامادەکردنی: ئەنفالستان**

ڕژێمی بەغدا هێندە بە شێوازێکی نامرۆڤانە مامەڵەی لەگەڵ کێشەی کورد وجوڵانەوە سیاسیەکەیدکردووە تەنانەت هێرشی پاکتاوکردنو لەڕیشە هەڵکێشانیشی بە پێشکەوتنوگەشەپێدان ناوزەدکردووە!! بەئاشکرا لەزۆربەی بەڵگەنامەکاندا دەردەکەوێت, هەروەك لەنوسراوو بروسکەکانیاندا هێرشی ئەنفالوتەخت کردنی گوندەکانی کوردستانیان لەژێر پەردەی(هەڵمەتی گەشەپێدانی ناوچەی باکور)ئەنجامداوە, ئەگەرچی ئەمە بۆچەواشەکردنی ڕایگشتی دەرەوەی عێراق بوو, بەڵام هەرلەناو بەڵگەنامەکانی رژێم خۆشیدا نەیان توانیوە, ڕاستیەکان بشارنەوە, چونکە هەندێك لەبەڵگەنامەکان ئەوە دەردەخەن کەنوسراووبروسکەگەلێکیش هەن ڕاستیان نەشاردووەتەوەولەبری گەشەپێدانی ناوچەی باکورنوسیویانە (هەڵمەتی کوکردنەوەی دێهاتەکان) یان( هەڵمەتی ڕیشەکێشکردنی گوندەکان) ئەمەش بەئاشکرا لە زۆربەی بروسکەکانی سکرتێری نوسینگەی باکورورازگروڕێکخەری پەیوەندیەکانی عەلیکیمیایی (تاهرتوفیق العانی )دا دەردەکوێت کەلەبری ( تگویرمنگقە الشمالیە) بە(تجمیع القری)هاتوون.



(( برقية سرية وفورية وعلى جناح السرعة ))

من : محافظة التأميم / لجنة [illegible]

الى : مديرية مرور محافظة التأميم

المعلومات : مكتب تنظيم الشمال لحزب البعث العربي الاشتراكي .. مع التقدير

وزارة الحكم المحلي / لجنة [illegible] المركزية

مديرية [illegible] والاحصاء بوزارة الدفاع

مديرية المرور العامة

رقم العدد [illegible]

التاريخ / ٤ / ١٩٨٧

استنادا الى توجيهات الرفيق عضو القيادة القطرية امين سر مكتب تنظيم الشمال .. تنفيذ الاجراءات الفورية بشأن تجميد كافة عجلات الحمل (اللوري والقلاب) والشفلات والبلدوزرات العائدة للقطاع الخاص لاستخدامها لاغراض حملة تطوير المنطقة الشمالية لمدة شهرين اعتبارا من ٢٠/٤/١٩٨٧ واعتبار العمل جزء من اعمال المجهود الحربي واعلامنا بالموقف [illegible] .

[illegible] نصيف جاسم

محافظ التأميم

رئيس لجنة [illegible]

بەڵگەنامەی یەکەم



صورة كتاب وزارة الدفاع المرقم [illegible] في ٢١/ [illegible] /١٩٨٧

حصلت الموافقة بكتاب ديوان الرئاسة المرقم السري ٢٠٨١٣ في ١٤/ايار/١٩٨٧ على استخدام الاليات والمعدات الهندسية العائدة الى القطاعين الاشتراكي والخاص في المحافظات التالية (التأميم - اربيل - السليمانية) لاغراض تطوير المنطقة الشمالية والمخصصة بمأمورية الرفيق عضو القيادة القطرية امين سر مكتب تنظيم الشمال ولحين انتهاء الاعمال وكما يلي :-

حساب مشاركة القطاع الاشتراكي من الاليات والمعدات الهندسية والاشخاص العاملين بالعمل على حساب المجهود الحربي من ناحية النقد للمعدات والحقوق بالنسبة للعاملين .

دفع مبالغ تكليف معدات واليات القطاع الخاص من قبل المحافظات [illegible] الرسمية المقررة من قبل لجنة تنظيم التجارة [illegible] .

يرجى التفضل بالاطلاع وتبليغ المحافظات المعنية واية محافظة اخرى تستخدم معدات [illegible] مع التقدير .

اللواء الركن

مدير التعبئة والاحصاء .

بەڵگەنامەی دووەم



برقية سرية

من : محافظة التأميم / لجنة [illegible]

الى : مديرية طرق محافظة التأميم

رقم العدد /خ/ ٦٠١

التاريخ ٨ /٧/١٩٨٧

يرجى ارسال بلدوزر ثقيل الى ناحية التون كوبري لمدة اربعة ايام لاغراض حملة تجميع القرى لغرض ازالة بعض الدور المبنية بالبلوك في قرية قيه باش واعلامنا .

انس عبد المجيد العمري

م/ محافظ التأميم

بەڵگەنامەی سێیەم

ئەمانەو لەگەرمەی هێرشەکانی ئەنفالدا دەسەڵاتدارانی بەعس هەوڵیانداوە تەواوی دامودەزگا مەدەنیەکانیش لە تاوانیئەنفالەوە بگلێننو بیخەنە خزمەتی ستراتیژەگلاوەکانی خۆیانەوە, لەچەندین بەڵگەنامەی جیاجیادا دەردەکەوێت, کەداوایان لەبەرێوە بەرایەتیەخزمەتگوزاریەکانی پارێزگاکانیش کردووە کەبەشداری لە هەڵمەتی( پێشخستنی ناوچەی باکور! ) بکەن,هەر وەك لە بروسکەی ژمارە(240)بەرواری 1987/4/20(نهێنیوبەپەلەوز ۆرگرنگ)داهاتووە (1): ( پشت بەستوو بەرێنماییەکانی هەڤاڵ ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمایەتی رازگری نوسینگەی ڕێکخستنی باکور ئیجرائاتی بەپەلەبکرێت لە ناردنی هەموو ئۆتۆمبیلەبارهەڵگرەکان( لۆریوگەلابە)شۆفڵوبلدۆزەرەکانی سەربەکەرتی تایبەت بەمەبەستی بەکارهێنانیان لەهەڵمەتی گەشەپێدانی ناوچەی باکور بۆماوەی دوومانگ لەبەرواری 20 /4/1987وە ئەمەش بەشێکەلەکاری (المجهودالحربی) تکایە لەهەرهەڵوێستێك ئاگادارمان بکەنەوە).

دیارەمەست لەهەڵمەتی گەشەپیدانی ناوچەی باکورجێبەجێکردنی سیاسەتی پاکتاوکردن بووە, ئەوەتا لە بەڵگەنامەیەکیتردا (2) بەئیمزای للوا ڕکن مدیر التعبیەوالاحصاداهاتووە دەڵێت : ( بەپێی نوسراوی ژمارە 20813لە14ئایاری 1987ڕەزامەندیمان وەرگرتووە تایبەتی بەفەرمانی هەڤاڵ ئەندامی پێشەوایەتی هەرێمایەتیو رازگرینوسینگەیڕێکخستنی باکور(عەلی حسن مەجید). ئامێرە ئەندازیاریەکان کە سەربەکەرتی ئیشتراکیوتایبەتین لەپاریزگاکانی (تامیم, هەولێر, سلێمانی ) بەکاربهێنین بەمەبەستی گەشەپێدانی ناوچەی باکور. هەرلەم بارەیەوە بەڵگەنامەیەکی تر( 3) کەبریتیێیە لەبروسکەی( نهێنیو بەپەلەو زۆر گرنگ) ژمارە 244یبەرواری 1987/4/23و بەئیمزای پارێزگاری کەرکوك موندر نصیف جاسم تیایدا هاتوو: ( بۆحاڵەتێکی زۆرئەمنی, بریاردراوە کەئامێرە ئەندازیاریەکان (المعدات الهندسی)بەشۆفێرەکانیانەوە دابین بکرێن بۆئەوەی لە هەڵمەتی گەشەپێدانی ناوچەی باکور بەکاربهێنرێن, ئەمەش بەشێکە لەکاری( المجهودالحربی)هەروەها دەبێت سبەینێ بەهۆی بارهەڵگرەکانتانەوە بگوازرێنەوە بۆناحیەی قەرەحەسەنولەکاتژمێر8ی بەیانی بەرواری1987/4/24 پەیوەندی بکەن بەناحیەوەوهیچ هۆکارێك بۆدواخستنی نیە, تکایە لەجێبەجێکردنی ئاگادارمان بکەنەوە.) لەبروسکەکەیدا پارێزگاری کەرکوك (مونزرنصیف جاسم) داوا لە ( شارەوانیەکانی سەربە پارێزگای کەرکوك, دامەزراوەی نەوتی باکور, دامەزراوەی گشتی ئیسکانی باکور, دامەزراوەی گشتی پرۆژەی ئاودێری سەدام, بەرێوەبەرایەتی شارەوانی کەرکوك, بەرێوەبەرایەتی ڕێگاوبانی پارێزگای کەرکوك, نوسینگەی خالد بۆبەڵێندەرایەتی دیاریکراو). کە شۆفڵو بلدۆزەرو شۆڤێرەکانیان ئامادەبکەنو لەکۆتایشدا دەڵێت : هیچ هۆکارێك بۆدواخستنی قبوڵ ناکرێ. ئەم بروسکەونوسراوانەش لەگەڵ قسەکانی عەلی کیمایی هاوجووت دێنەوە کەلەکاسێتەتۆمارکراوەکانیدا دەڵێت:

بەشۆفڵ لەگۆڕیان دەنێم بەهەموولایەکدا بڵاویاندەکەمەوە. بەتایبەتی بەڵگەنامەی ژمارە (3) کە بروسکەیەکی (نهێنی)یە بەژمارە /خ/ 601 لەبەرواری 1987/7/8بەئیمزای ( ئەنەس عبدالمجیدالعمری)دەرچووە ئەو راستیە ساغ دەکاتەوە کەکۆکردنەوەوبەکارهێنانی هەموو ئامێرە ئەندازیاریەکان لە جۆری شۆفڵوبلدۆزەروگەلابەکان بۆ گەشەپێدانی ناوچەی باکورنەبوون, بەڵکو بۆڕیشەکیشکردنو تەختکردنی گوندەکان بوون, بروسکەکە دەڵێت : تکایە بلدۆزەری قورسمان بۆبنێرن بۆ ناحیەی ئاڵتون کۆپری بۆماوەی چوار ڕۆژبەمەبەستی هەڵمەتی کۆکردنەوەی گوندەکانو تەختکردنی هەندێك خانوو کەبەبلۆك دروستکراون لەگوندی (قیەباش )وئاگادارمان بکەنەوە لەجێبەجێ کردنی.

# عێراق بەم کەلتورەی ئەمڕۆیەوە

# کەبارگاویە بەبەعسیزم دووبارە لەبەردەم ئەنفالکردنەوەی نوێدایە



کۆمەڵگەی کوردی، کۆمەڵگەی 17ساڵ پاش کارەساتی ئەنفال‌و جینۆساید کردنێتی، بەداخەوە هەتا ئەمڕۆش کە 14ساڵ بەسەر رزگارکردنی کوردستان و3ساڵ بەسەر ڕووخانی یەکجاری رژێمی سەدامدا تێدەپەڕێ، هێشتا ئەوەی سەبارەت بەئەنفال‌وپاکتاوی ڕەگەزی‌کراوە، دەشێت بڵێین لەچاوقەوارەی کارەساتەکەدا، لەجێگەی نەبواندایە، ئەگەرچی لەم چەندساڵەی دواییدا چەند هەوڵێکی زۆرسەرەتایی هەن وەك (دۆکۆمێنتکردن‌ودەرکردنی بڕیارێکی تایبەت بۆکۆتایی هێنان بەکێشەی (وونبووەکان) وبڕینەوەی موچەیەکی مانگانە وەك یارمەتییەك بۆ پاشماوەی خێزانەکانی ئەنفال، بەڵام ئەم هەولانە سەرەڕای باشیشیان، هێشتا ناکاتە ئەوەی ناوی هەوڵی جدی‌یان لێبنێین بۆ لابردنی کاریگەریەکانی ئەوپەلامارەی کەسەرتاپای بونیادی کۆمەڵگەی کوردی شێواندووە، چونکە کاریگەریەکانی وەها هەڵمەتێکی دڕندانە بەسەرکۆمەڵگاوە، تەنها بەم چەند هەوڵە کۆتایی نایات، بەڵکو خوێندنەوەی ڕەهەندە جیاوازەکانی دەسەڵاتی بەعس کە جینۆسایدی بەرهەمهێناوە، هێندەی دژواری ئەوئەرکە گرنگ‌وپڕبایەخەوکارێکی لەرادەبەدەر پێویستە کە کۆمەڵگەی کوردستان بەتایبەتی‌و ناوچەکەو جیهان بەگشتی ئەنجامی بدەن، بۆیە ئەگەر لە رابووردوودا بەهەرهۆیەکەوە بووە خەمساردیان لێکردووە، ئیدی لەمەولا رۆشنبیرانی کوردو دەزگا رۆشنبیریەکانی‌وزانکۆکان ئەرکی سەرشانیانە پرۆژەی گەورە گەورە بخەنە دەستوری کاری خۆیانەوە بۆ خوێندنەوەی ئەو دەسەڵات‌وکۆمەڵگەوعەقڵییەتە تۆتالیتارەی کە کارەساتی ئەنفالی لێکەوتەوە مرۆڤی حاقدوئەنفالچی فڕیداوەتە ناوبوونیادی کۆمەڵایەتیمانەوە. ئەمەجگەلەوەی کە پێویستە هەموو قوربانیانی هێرشی ئەنفال لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان‌وحکومەتی ناوەندی عێراقەوە کەئەمڕۆ کوردتیایدا لەلوتکەی دەسەڵاتدایە قەرەبوو بکرێنەوە.

قسەکردن لەسەر ئەنفال تەنها بەحەسرەت بۆ هەڵکیشان‌و دەرکردنی بڵاوکراوەو یادکردنەوەی رۆتین نابێت، بەڵکو یەکێك لەئەرکە هەرەگرنگەکانی کۆمەڵگەی کوردی بەتایبەتی‌و عێراق بەگشتی ئەوەیە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی زانستی هەمەلایەنە لەمەڕ ئەنفال‌و ڕەهەندە جیاوازەکانی ئەنفالەوە بکات، لەو هۆکارە بنەڕەتییانە بکۆڵێتەوەکە دەستی بەعسی ئاوالاکردبۆ ئەوەی زەمینەی ئەنفالی ساز بکات، ڕاستە عێراق بەدەست سەرکردەیەکی نەخوێندەوارو تۆتالیتاری گەوجەوە گیرۆدە بوو، بەڵام درێژە کێشانی دەسەڵاتی بەعس مەسەلەیەك نیە هەروا ئاسان لێی بڕوانین‌و بەئاسانی بەسەرماندا تێپەڕێ، درێژە کێشانی وەها سیستمێکی تاریك‌و چەواشە مەسەلەیەکە پێویستی بەهەڵوەستەودیقەت هەیە، مەسەلەیەکە خەڵکی عێراقیش تیایدا گوناهبارە، بەمێگەلکردنی خەڵك‌و قبوڵ کردنی بەمێگەل کردنی خەڵك ئەمدیووەو دیوی دراوێکن‌و دیاردەیەکی هەتابلێی ترسناکو هەنگاومان بەرەو تاریکی پێدەهاوێ،

بەم زووانەئاسەوارەکانی ئەنفال بەئاسانی لێمان نابنەوە، تاکە زەمانەت بۆ نەمانی ئەو ئاسەوارانەو دوبارەنەبوونەوەی ئەنفال ڕیشەکێش کردنی کەلتوری بەعسە، پرۆسەی لەبەعسی خستنی کۆمەڵگا یەکێکە لە گرنگترین ئەو ئەرکانەی کەدەبێت هەنگاوی بۆهەڵگیرێ، خەڵکی عێراق پتر بۆنیو سەدە دەچێت لەبەردەم هەڕەشەی چەواشەبووندایە، گرفتەکە لەوەدایە ئۆپزسیونەکانی بەعسیش هێندە تەندروست تەماشای مرۆڤۆزیان ناکەن، ئەوانیش هەموو بەوانەشەوە کە پروپاگەندەی دەوڵەتی عەلمانی دەکەن، کەمتر ئاشنایەتیان لەگەڵ مرۆڤدۆستیدایە، ئەوانیش بەشێوەیەك لەشێوەکان مردوپەرست‌و دەستەمۆی تاریکین، بۆیە، ئەگەر عێراقیەکان وەلامی تەندروستی ئەوترسەنەدەنەوە ئەنفال‌وجینۆساید ترسێکە لەبەردەمان ئامادەیە .

# کەسوکاری ئەنفالکراوەکان ئومێدیان بەتاڵەبانییە

کاروان یاروەیس:

لەرۆژی هەڵبژاردنەکانی عێراقدا لەناحیەی ڕزگاری کەمەڵبەندی نیشتەجێبوونی کەسوکاری ئەنفالکراوەکانە پیاوێکی بەتەمەن کەژمارەیەك کەسوکاری ئەنفالکرابوو,نەخوێندەواربوو کەفەرمانبەرکە لێ‌پرسی دەنگ بۆ چ لیستێك دەدەیت ئەو گووتنی من لیست نازانم هاتووم دەنگ بدەم بۆ مامجەلال .

ئەمە وتەی مرۆڤێك بوو کەژمارەیەك لەئەندامانی خێزانەکەی لەئەنفالدا لەدەستداوەو گوندەکەی روخێنراوەو ڕەزو باخ وئاژاڵەکانی نەماو، لەتاو هەڤدەساڵ چاوەڕوانی ئازیزەکانی هێز لەقاجەکانی‌و سۆما لەچاوەکانی نەمابوو کەچی وەك ئەوەی بڵێ ئەو رۆژە رۆڵەکانی لەعەرعەرو نوگرە سەلمانەوە بگەڕێتەوە هەربەیانی زوو لەبەردەم یەکێك لەناوەندەکانی دەنگداندا لەریزدا وەستابوو بچێت دەنگ بدات وەك خۆی دەیگوت من دەنگ بۆ مام جەلال دەدەم، ئەم وتەیە زیاد لەیەکجار لەکەسوکاری ئەنفالکراوەکان گوێم لێبووە، ئەو پیاوە وهاوشێوەکانی ئەو جاك دەیانزانی چ دەلێ‌وچ دەیکات , دەیشی‌زانی تاڵەبانی سەرۆکایەتی رۆڵە هەلبژێردراوەکانی گەلەکەی دەکات بۆ بەغدا بۆئەوەی مافە ڕەواکانی گەلەکەی بچەسپێنێ‌وئومێدی گەورەیان هەبوو بەمام.

ئەمە نمونەیەکی بچوکو لەسەدان نمونەی تر، هەزاران کەسوکاری ئەنفالکراوەکان هاوشێوەی ئەو پیاوە بەتەمەن لەدوورترین گوندە ئەنفالکراوەکانی گەرمیانەوە دەهاتنە شارو شارۆجکەکان بۆئەوەی بۆ دەنگدان، لەناحیەی سەرقەلا کەژمارەیەکی زۆری گوندنیشنی کەسوکار ئەنفالکراو دەنگیان لێ ئەدا، هێشتا کاتژمێرێك بوو پرۆسەی دەنگدان دەستی پێکردبوو نیوەی زیاتری هاولاتیان دەنگیان دابوو، نیوەکەی تریش لەدەرەوەی ناوەندەکەوە لەریزەوە وەستابوون و پال پالانیان بوو بۆئەوەی تۆزێك زووتر دەنگ بدەن، هەربەپەرۆشی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان و خەڵکی کوردستان بوو کە کورد بەوە دەنگانەی کەهێنای توانی ببێتە خاوەن سەنگ وقورساییەکی زیاتر لەبەغداو ئەورۆژەش بێتە کە سەرکردە ماندونەناس و تێکۆشەرەکەی کورد مام جەلال ببێتە سەرۆك کۆماروئاواتی ئەوهەموو گوندنیشین وکەسوکاری ئەنفالکراوەکان هاتەدی کەوەك خۆیان دەیانگوت هاتووین دەنگ بدەین بەمام بۆئەوەی ببێتە سەرۆك ئەم خۆشەویستیەش بۆمام لەڕوانگەی ئینتمای تەسکی حیزبایەتی‌یەوە هەڵنەقولاوە بەڵکو لەو ڕوانگەیەوەیە کە ئەو سەرکردەیە چەند بەتواناوژیر وماندوونەناسەو نەسرەوت تاسەرکەوت.

ئەمرۆ کە هەڤدە ساڵی تەواو تێ‌ئەپەرێ بەسەر پرۆسەی بەدناوی ئەنفالداو یادی ئەو ڕووداوە جەرگبڕە دەکەینەوە کەلەهەر ڕوویکەوە خوێندەوە بۆ دۆخەکە جیاوازە لەساڵانی ڕابردوو کەیادی ئەنفالمان دەکردەوە، تەماشا ئەوانەی کوردیان ئەنفال دەکردو دەیانچەوساندنەوە ئێستا لە زیندانداو چاوەڕوانی سزای کردەوە قیزوەنەوەکانیان دەکەن وسەرکردەیەکی ماندووتێکۆشەری کورد سەرۆکی عێراقەو ئەنجامی دادگاییکردن وسزاکەیان دەچێتە بەردەم مام جەلال ئیمزای بکات، بەڵام دڵفرەوانی لێبوردەیی مام ڕەنگە گرفتێك بێت ئیمزا لەسەر ئیعدام کردنیان بکات، هەرئەو جیاوازە وای لێکردم لەگەڵ چەند برادەرێکدا پێشنیاری ئەوەبکەم کە ئەمساڵ یادەکە جیاواز لەساڵانی ڕابردوو بکرێتەوە، ئەم دەرفەتەو بوونی مام جەلال کۆشکی کۆماریدا بقۆزینەوە بۆئەوەی کاری جدی بۆ مەسەلەی ئەنفال وکەسوکاری ئەنفالکراوەکان بکرێ، دڵنیاشم کەهەروەك چۆن سەرۆك تاڵەبانی لەهەردوو ووتەکەیدا لەئەنجومەنی نیشتمانی عێراقدا ئەنفالی لەبیرنەچوو قسەی لەسەرکردو چۆن لەڕابردوشدا خەمخۆرو داکۆکی کاری کەسوکاری ئەنفالکراوەکان بووە، ئاواش ئێستا وەلامدانەوەی جدی دەبێت لەسەر هەر پێشنیارو داواکارییەك پەیوەستە بەئەنفالەوە.

# لەنێوان یەکێتی‌وپارتیدا مۆنۆمێنتە هاوبەشەکەی ئەنفال چی بەسەرهات ؟

لەتیف فاتح فەرەج

ئەوانەی ژن‌وئافرەت، خوێندکاروقوتابی، (سەرۆك‌وسەرەك) ونیشتمانیان دابەشکرد، شانسیان نەبوو لەووشەی ئەنفال‌وکیمیابارانداو، دەنا ئەویشیان دابەش دەکرد، یارتی‌ویەکێتی‌ودوو هێزەی هەمیشە باسی یەکێتی‌ویەکگرتن دەکەن‌ولەولاشەوە نیشتمانیان لەت‌ویەت کردووە!! تەنانەت کاریگەری دابەش کردنەکانیان گەیشتووەتە نێوخێزانەکانی کوردەواریش، لەسەرشوێنی مۆنۆمێنتێکی هاوبەش ڕێکنەکەوتن بۆئەنفال، ئەم دوو هێزە کە لە دوو میلیشیاکانی هۆتسی وتۆتسی رواندا دەچن وبە زۆر دەیانەوێ قسەی تورك لە سەرخۆیان بکەنەماڵ کە بە دوو (عەشرەت) ناویان دەبات، ئەنفال و شەهید وپێشمەرگە وزۆر شتی دیکەیان دابەش کرد، ئەگەرچی لەبەرانبەر وشەی (ئەنفال) دا دەستەپاچەن وناچارن بڵێن ئەنفال وهیچی دیکە!! خۆ مۆنۆمێنتەکە پارەی بۆ تەرخان کرابوو یەك دوو شوێنیش لەبەر چاوگیرا بوو، ئیدی بۆ وابەخێرایی ئەویش دابەشکرا ؟! ئەمەکارەساتێکی گەورەیە نەتەوەیەك نەتوانێ لە هیچا بەیەکەوەبێت، تەنانەت لەوچرکەساتانەشدا کە بەیەکەوەین، لەییلان دەگەرێین دژی یەکدی، مێژو مان یرە لەنوکتەی لەوجۆرە تەنانەت حاجی قادری کۆیی لەبارەی دۆزی خۆمانەوە ووتوویەتی:

**بۆ ئەمیرانی غەیرە دەبنە گزیر**

**نەك لە خۆیان یەکێکی بێتە ئەمیر**

سەرەرای کۆی ئەوبرینانە ئەوەی من تێبیینم کرد، کارەساتی ئەنفالی ئەمساڵ لە هەولێر ودهۆك وئەودەوروبەرە بەرادەی سلێمانی وکەرکوك بایەخی پێنەدراو یادی نەکرایەوە! من تەمەنا دەکەم ئەوەش جۆرێك نەبێت لەدابەشکردن و لەوسنورە رۆژێکی دیکە دانەنرابێت بۆیادکردنەوە، یادنەکردنەووی ئەنفال لە هەولێرودهۆك وەك پێویست بەرروویەکدا هەولڵدانە بۆ فەرامۆشکردنی ئەو کارەساتە، هەرچەندە ستافی ( گۆڤاری گوڵان ) خەمخۆرانە بایەخیان بەو یادە دا ، بەڵام وەکی تر ئەوەی لەحەڤدە هەمین ساڵ یادی ئەنفالەکاندا لە سلێمانی‌وکەرکوك‌وگەرمیانکرابەداخەوە لەهەولێرودهۆك نەکرا! تۆبڵێ ئەنفالکراوەکانی ئەودەڤەرە گەرابێتنەوە؟ ئەمە پرسیارێکەوهیچی دی .

# ئەوانەی لەهەڵەبجە رزگاریان بوو، بەرشالاوی ئەنفال کەوتن

ژیان حەمە سەعید/گەرمیان

هەردووکارەساتی یەك لەدوای‌یەکی هەڵەبجەو ئەنفال ناسنامەی ئەوپەری ستەمکاری شۆڤینیەتی بەعس بوون دەرهەق بەگەلی‌کورد، گەورتین مەرگەساتی سەدەی‌بیستەم بوو، کە لەماوەی سالێك‌وچەند مانگێکدا هەزاران مرۆڤی کوردی کردە قوربانی سیاسەتە شۆڤینستی‌یەکانی‌خۆی، تەنهالەشاری هەڵەبجە پتر لە(5000) مرۆڤی کوردبەژن‌ومنداڵ‌وگەنج‌وپیرەوە کوژران‌وهەزاران برینداروەدەیان هەزاریش ئاوارە بوون، مەگەر تەنها کورد خۆی بتوانێ گوزارشت لەوکارەساتانە بکات، دلڕەقی بەعسی‌یەکان هێندە بێ‌سنوربوو تەنانەت ئەوانەشی لە هێرشی کیمیابارانکردنی هەڵەبجە قوتار ببون‌ولەدوای کارەساتەکە بە بڕیاری لێبوردنەساختەکەی بەعس گەرابوونەوە جارێکی تر بەرشالاوی ئەنفالە دزیوەکان کەوتن‌وبەرەو بیبانەکانی خواروی عیراق‌وقەلامەرگبارەکەی نوگرەسەلمان راپێچ کرانەوەوپاش ئازارو ئەشکنجەیەکی زۆری رۆحی‌وجەستەیی ولەبڕیارێکی سیناریۆئامیزدا هەندیك لەوپیرە پیاوو پیرەژنانەیان ئازاد کردبوو کە مەبەستی سەرانی بەعس لەچەواشەکردنی ڕای گشتی جیهان‌وناوچەکە بەدەرنەبوو، شایەتحاڵەکانی نوگرەسەلمان دەگێرنەوە کە خەڵکێکی زۆری هەڵەبجە بەبرینداری هێنراونەتە نوگرەسەلمان، پورە (فەریدە) کە ئێستادانیشتووی ئۆردوگای رزگاری‌یەو یەکێکە لەشایتحاڵەکانی نوگرەسەلمان دەلیت: رۆڵە چیتان بۆبگێرمەوە، منداڵەکانیان لێ‌سەندبوین‌وجیایان کردببونەوە، پیاوەکەشم هیندە ئەزیەت‌و ئەشکنجە درابوو چاوەکانی لەدەست دابوون، ئێمە لەوێبووین لەپاش ماوەیەك خەڵکێکی زۆریان هینایە قەلاکەی نوگرەسەلمان، ووتیان هەڵەبجەیین بەخواهەرلەپێش چاومان کورێکی زۆر جوان‌ولاویان شەهید کرد، هەرگیز دیمەنی ئەوکوڕەم لەپێش چاو لاناچێ، کە داکۆکی لەخوشکەکەی دەکرد کاتێك، جەلادەکان بەپیش چاویانەوە سوکایەتی‌یان پێکردبوو، ئەویش قەبولی نەکردبوو،هەروەها (مدیحە ابراهیم)یش خەڵکی گوندی (عەزیز قادر)ی ناوچەی گەرمیان ووتی: ئێمە پێنج مانگ دەبوو لەنوگرە سەلمان بووین، ژمارەیەکی زۆر خەڵکی هەڵەبجەیان هێنا، بەخوا 200تا300 کەس دەبوون هەموو بیزارو تورەبوون لەپێشچاومان کوڕێکیان شەهیدکرد ودووکوڕی تریشیان بەناوی (ستاروشەماڵ) زۆر ئازاردا، لەپێش چاومان، داوای مردنیان دەکردو دەیان ووت ئێمە ژیانمان ناوێ هەموو کەسمان بەکیمیایی مردووە، بەعسی‌یەکانیش لێ‌یاندەدان، هەرلەم بارەیەوە(حاجی قادر)خەڵکی گوندی (مرەوە)ی‌ناوچەی سەنگاو ووتی: بەهاتنی هەڵەبجەیی‌یەکان خەڵکێکی زۆرلە ئێمەش مردن، ئەونەخۆشی‌یەی بەوانەوە هات وەك تاعون وابوو، رۆڵە مەرگە سات بوومەرگەسات.

بەدەیان کوروکچی جوانخاس بەپێش چاومانەوەدەمردن‌وهیچ دەسەلاتێکیشمان نەبوو، چەندرۆژێك بەوگەرمایە تەرمەکانیان بیناز دەکەوتبوون‌ونەیاندەهیشت بیانخەنەژێرخۆلەوە( بیانیژین)، رۆڵە ئەوەی بەعس بەئێمەی کرد کافر نەیکردووە، هەرمەپرسە، خۆزگەمان بەمەرگێکی خێرادەخواست، نەك ئەوهەموومەرگەساتەی ئێمە بینیمان.



# 4/14 گەرمیان سەرتاپای لەچالاکیی هونەری دابوو

# پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کفری ویادی 17 هەمین ساڵەی مەرگەساتی ئەنفال

هونەرمەندان‌ونوسەرانی گەرمیان چەندە بەژمارە کەمن بەڵام خەمی گەورە وهونەری گەورەیان بۆ کارەساتی ئەنفال لەئەستۆناوە, وەلێ ئازارێك بەجەستەی گەرمیانەوەیە لەوە ناچێت حەکیمەکانی ئەم دەوروزەمانە بۆیان تیماربکرێت, هاواری هونەرمەندورۆشنبیرانی گەرمیان هاواری راستەقینەی ئەنفالکراوەکانی گەرمەسێرە, دەنگی مام ڕەشیدەکەلەنوگرەوسەلمان گەڕاوەتەوەومەگەر هەرخۆی بتوانێ حیکایەتی ئەودۆزەخە بگێڕێتەوە, دەنگی میمکەمەحروبە یە کە بوك‌وکچ‌وکوڕەکانی لەتۆپزاوا لێجیاکراونەتەوەو هەرچاوی لەڕێیانەو لەلیوا ڕشەکەی کەلار دەبێتە حیکایەتخوانێکی ڕاستەقینەو پاش تەواو بوونی نمایشی یادی مەرگەساتەکەش دەگەڕێتەوەناو خانوە ساردوو سڕەکەی کەبەئاستەم هەناسەی تێداماوە, ئەوان پاش نمایش ناچن بۆ نادی شەوانە, ئەوان بەراستی بەحەسرەتی ئەنفالەکانەوە رۆژدەکەنەوە 4/14خۆیان سەغڵەت ناکەن‌و 4/15 بێخەم لێی بخەون, ئەوان ئەنفال هەڵیقرچاندوون‌و دەیانەوێت ترسی ئەنفال بەیەکجاری لەکۆڵ مرۆڤ بێتەوە ئەو ئازارەی ئەوان دیویانە ئاواتە خوازن دوژمنەکانیشیان نەی بینن, کۆستکەوتەن وەلێ ئەمرۆ نەدەسەڵاتی کوردی ونەدنیای دەرەوە. ناتوانێ یان نایەوێ قەربوویان بکاتەوە, ئەوپیرەژنە کۆستکەوتەیە هێشتا بەپشتێکی کۆم‌وبەکۆڵێك خەمی قورسەوە, بەمشتێك چاوی لێوونبووەوە خەریکی قوڕ شیلانەو تەنوربۆنانی گەرمی ئەوانیدی دروست دەکات, لەنێومەزرا بۆ جوتیارەخواپێداوەکان عارەق دەڕێژێ, بەو هەموو خەمەوە خەمی ئەنفالی بادینانیشی لەکۆڵناوە, کەچی ئەفسووس مرۆڤایەتی بەوهەموو سەروەت‌وسامانەوە, بەوهەموو دینارو دۆلارەوە, کۆمەڵگا بەوهەمووە پیاوماقووڵەوە!!

بەوهەموو بەرپرس‌وحاکم‌وقازی‌و پارێزەرەوە بە چەندین ڕێکخراوی‌خێرخوازەو مافی مرۆڤەوە, ناتوانن خەمێك لەکۆڵ ئەومرۆڤانە بکەنەوە کە بەعس پڕی کردن لە خەم .!!

پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کفری بە مامۆستا و خوێندکارو کارمەندەکانییەوە خەمی 4/14/ یان لە لیوا رەشەکەی کەلاری کۆن. نمایش کردو هونەرمەند سەربەست ئەحمەد محمد بەجوڵەیەکی هونەری‌ئاهەنگ سازی وشانۆیی‌و هونەری بەرزەوە دەقی (دوای 17 ساڵ لێرە وئۆغریان کرد)پێشکەش کردن ومەکینەوئالای عێراق وژن وکۆستکەوتن وهەڵپەرکێ وسورانەوەی بەردەوام ودەنگی مۆسیقا هەموئەمانە تا دەگاتە سواڵ وصەدەقەی پاشماوەی ئەنفال وبەردەوامی کاراساتەکەی هێنایەوە بەردەمی نەوەی نوێ, خستیەوە بیری ئەو بەرپرسانەی تەنها لە4/14دا ئەنفالەکانیان بیردەکەوێتەوە, ئەوچالاکیە زیاتر لە 55 ئەکتەری کور وکچ تیایدابەشدار بوون هەموویان جەستەیەکی پڕ چۆش وخرۆشی گەرمیانی بوون, شێوازی بەکارهێنانی کەرەستەوکارە ئەکتەرەکان دوور لە چەك وسەرباز وتانك وتفەنگ کارێکی‌هونەریی سەرکەوتووبوون. هەروەها تابلۆی سەردیوار وچیرۆکە پەیکەروتابلۆی150م ی بەرهەمی هونەرمەند جمال خەتات‌و خوێندکارانی پەیمانگا بوون وگوزارشتی‌گەورەیان لە رووداوی ئەنفال دەکرد.

بەشی مۆزیکی هەمان پەیمانگاش بە سەرپەرشتی مامۆستا صلاح ومامۆستا عباس وخوێندکاران, سروودیان بۆ گیانی ئەو خەڵکە چڕی‌و ژیانیان بەبەر وێژدانی مردووی مرۆڤداکردەوە .

هاوکات دەرگا لەسەرپێشنگای سەردیوارکرایەوەو بینەران لە ناوڕاستی ڕووداوێکی شانۆوە خۆیان لە ناو تابلۆگەلێکیشدا بینیەوە. ئەم هەوڵە هونەریەش مامۆستا سیروان و مامۆستا محمد وخوێندکارانی بەشی شێوەکاری پەیمانگا نەخشاندبوویان, هەر لە هەمان کات‌و شوێندا ولە نهۆمی دووەم. مامۆستا ایهان‌و خوێندکارانی بەشی پەیکەرسازی پەیمانگا چەند ژوورێکیان بە هونەری پەیکەرتاشی‌و چیرۆکی جیا جیای ئەنفال نمایش کرد.

بەڕێوەبەرایەتی مافی مرۆڤ وئاوارەو ئەنفال, حەڤدەهەمین ساڵیادی ئەنفالەکانیاکردەوە.

هەمان رۆژ بەڕێوەبەرایەتی مافی مرۆڤ و ئاوارەو ئەنفالی گەرمیان بەهاوکاری چەند مامۆستایەکی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کفری, لە شاری دووز هەڤدەیەمین ساڵیادی ئەنفالییان بە ئامادەبونی ژمارەیکی زۆری‌خەڵکی ناوچەکەوبەچەندکارێکی هونەری بەرز راگرت. چالاکی یەکانیان بریتی بوون لە : دیمەنێکی دۆکیومێنی ئەنفال کە سەرجەم ئەکتەرەکان خۆیان لەناو مەرگەساتی ئەنفالدابون, بۆیە دەشێت بڵێین وێنەیەکی راستە قینە بوون لە ئەنفال. چالاکی دووەمیان بریتی بوو لە کردنەوەی

پێشانگایەکی هونەری شێوەکاری بۆ (350)خوێندکاری سەرەتایی شاری دووز کە واتاودەلالەتەکانی ئەنفالی پیشان دەدا. هەروەها لەشاری خانەقینیش لەهەمان بەرواربەڕێوەبەرایەتی مافی مرۆڤ و ئاوارەو ئەنفالی گەرمیان بەهاوکاری راگەیاندنی مەڵبەندی ڕێکخستنی خانەقین(ی.ن.ك) هەڤدەیەمین ساڵیادی ئەنفالییان بەرز راگرت ولەلایەن هونەرمەندانەوە 182 مۆم درا بەدەم ئاوی ئەلوەندا, ئەمانەو منداڵانی شاری خانەقینیش بە سرودی ئەی ڕەقیب

وشەهیدان بەشداریان لە یادەکەداکرد.

1 لەشاری کەلار فیلمێکی دۆکیومێنتی بەناوی ( باوکم )کە فیلمێکی دۆکیومێنیە لەلایەن چەند هونەرمەندێکەوە کاری نواندنی تیادا کراوە لەسەر شاشەی تەلەفزیونی (ئایندە) پێشکەش دەکرێت.

2 لەشارۆچکەی رزگاری لە 2005/4/14 کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان بەهاوکاری بەڕێوەبەرایەتی مافی مرۆڤ و ئاوارەو ئەنفالی گەرمیان بە چەند کارێکی

هونەری ئەو یادەیان بەرز راگرت بە ئامادەبونی ژمارەیەکی بەرچاو لە کەس و کاری ئەنفالکراوەکان.

3 لە شارۆژکەی رزگاری بەڕێوەبەرایەتی مافی مرۆڤ و ئاوارەو ئەنفالی گەرمیان بەهاوکاری قائیمقامیەتی قەزای کەلار و بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی رزگاری و سەرۆکایەتی شارەوانی رزگاری بەئامادەبونی شێخ محمد شاکەلی و شێخ حمەلەتیف سەرپەرشتیاری مەڵبەندی گەرمیان و بەڕێوەبەری گشتی ئەنفال قائیمقامی قەرزای کەلار و بەڕێوەبەری ناحیەی رزگاری

و بەڕێوەبەری مافی مرۆڤ لەگەرمیان (700)پارچە زەوی بەسەر کەسو کاری ئەنفالکراوەکان دابەشکرد.

**رۆژی 4/14 لەیادی کارەساتی ئەنفال‌وجینۆسایدی کورد نوسەر لەتیف فاتح فەرەج لە هۆڵی سەنتەری گەنجان ئێوارە کۆڕێکی سەبارەت بە رۆڵی جاش لە ئەنفالەکاندا بەست‌و لەژێر ناوی (جاش‌و ئەنفال) پێشکەشی کرد, شایانی باسە خەڵکێکی زۆر ئامادەی کۆڕەکە بوون.**



# چالاکیە هونەری یەکانی شاری سلێمانی لەیادی حەڤدەهەمین ساڵیادی ئەنفالدا

وەزارەتی مافی مرۆڤو ئاوارەو ئەنفال میوانداری پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلیمانی کرد بۆ پێشکەشکردنی کەڤاڵی شانۆیی (**سروودەکانی تابووت**).

لەنوسینی سەلاحە رەش‌و دەرهێنانی هونەرمەند مۆفەق لهۆنی لەسەر سەکۆی ئازاد لەناو پارکی ئازادی. شایانی باسە نزیکەی 17 ئەکتەری کوروکچ لەخویندکارانی بەشی شانۆی پەیمانگای هونەرە جوانەکان لەو هەناسە شانۆییەدا بەشدار بوون.

هەروەها پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلیمانی بەشی شانۆ (**وەرزەئاڵەکانی عەدەم**)ی نمایش کرد لەهۆنراوەی جەمال



غەمبارو ڕێکخەری هونەرمەند شانازمحەمەد کەریم لەهۆڵی پەیمانگای هونەرەجوانەکانی سلیمانی. لەم بەرهەمەشدا نزیکەی 30 خوێندکاری پەیمانگا بەشدارییان کرد,

شایانی باسە ئامادەکردنی مۆسیقا لەلایەن هونەرمەند عادل کەریم ەوە بوو, جێبەجێ کردنی ڕێبین مەحمود ئاوازوو ووتنی ئازاد خانەقینی بوو.

هەروەها لەژێر سەرپەرشتی وەزارەتی رۆشنبیری‌دا تیپی نواندنی سلێمانی شانۆیی (**داستانێ لەئەنفال**)ی لەهۆڵی ئەمنە سوورەکەی سلێمانی نمایشکرد, ئەم بەرهەمە لەنوسین‌و دەرهێنانی هونەرمەند بەکر رەشید بوو, نمایشکاران لە هونەرمەندان (نیاز لەتیف, سۆزان باباعەلی, شیروان عزەت, بهالدین عازەبانی , رزگار رحمن, میران عبدالە , چەند ئەکتەرێکی تر پێکهاتبوون.

# بۆچی ئەنفالستان لە 4/14 دەرنەچوو ؟

ئەفسوس, خەریکە رۆتین هەموو جموجۆڵێکمان کۆنترۆڵ دەکات, ناکرێت 3/16یان 4/14 بەناوی یادی هەڵەبجەوئەنفالەوە بکەینە دوکانێك‌وڕۆژانی دوایی دەڕابەکانیان دابدەینەوە, ئەم دیاردەیە موزەیفەو لەڕاستیدا نەك یادکردنەوەوخەمخۆری نیە, بەڵکو لەکۆڵ خۆکردنەوەیەکەوەیەوبەس, من 3/16ی ئەمساڵ هیچم نەنووسی بەڵام هەفتەیەك پاش یادی هەڵەبجە بابەتێکم نوسی کە ناردم بۆ بڵاوکردنەوە خاوەنی بڵاوکراوەکە پێی ووتم: بابەتی ترم بۆبنێرە تازە یادی هەڵەبجە گوزەشت!! بەڕاستی ئەوقسەیە توشی شۆکی‌کردم,

لەکاتێکدا ووتارەکە لەسەر ئەوەبووکە چیدی شەتەکنەبین بەتەنها ڕۆژێکی یادەکانەوە, ناکرێت هەموو هەوڵەکان لەرۆژێکدا چڕبکەینەوەو ڕۆژانی دواتردەست بخەینە ژێر چەناگەمان, بەتایبەتی هێرشەکانی ئەنفال لە کۆتایی مانگی شوباتەوە تا سەرەتای مانگی ئەیلولیان خایاند, ڕاستە 1988/4/14زۆرترین خەڵکی گەرمیان ئەنفالکران, بەڵام بەدرێژایی 200 رۆژ

لەناوچەکانی‌ترگوندنشینەکان کیمیاباران دەکران, دەگیران‌وهەرلە شوێنی خۆیان گوللە باران دەکران, هەتا ئەمرۆش ئەوتاوانانە برینی چارەسەرنەکراون, بۆیە من وابەستەیی بەتەنها رۆژێکەوە بەکارێکی باش نازانم پێشم باشە ئەگەروەك یادکردنەوەش بێت هەوڵەکانمان دابەش بکەینە سەر ئەو چەند مانگەی کەکورد تێدا ئەنفالکرا, ئەمە وەك یادکردنەوە, دەنا ئەنفال پێویستی بە

لێکۆڵینەوەو لێتویژینەوەی زانستی فرە ڕەهەند هەیە, ئەمەش پتر ئەرکی زانکۆکان‌و پسپۆڕەکانی بواری کۆمەڵناسی‌ودەروناسی‌و بەعسناسی یە, بۆیادی ئەنفال نەرۆژی دەست پێکردنی هێرشەکان لە جێگەی خۆیدایەتی‌و نەرۆژی کۆتایی هاتنی, هەربۆیە من یادی کیمیا بارنکردنی گۆپتەپەم بۆ بڵاوکردنەوەی ئەنفالستان بەباشتر زانی لە 4/14.



ئەنفالستان ناوی نامیلکە شیعرێکە کە حەمەسەعید زەنگەنە ئامادەی کردووەو لە زنجیرەی بڵاوکراوەکانی کۆمەڵی هونەروویژەی کوردی یە, ئەم کتێبە دیاری رۆژنامەی سێبەرەو تابلۆی بەرگەکەی هی هونەرمەند فەهد شوانی‌یە, ئەوشاعیرانەی لەم کتێبەدا بەشداریيان کردووە ئەم بەرێزانەن:

ئاوێزان نوری,ئیدریس حاجی سەعید,بورهان بەرزنجی, چنورنامق حسەن,خالد مەجید, داناعەسکەر, رۆزا ئەحمەد , زایەر زەنگەنە, ستارئەحمەد , عومەرسەیدە, عەباس مەجید, فەهدشوانی, فریاد ئەحمەد ,لەتیف فاتح فەرەج, یوسف لەتیف

## سوپاسی

## ئەنفالستان بۆ بەرێزان:

- **کاك سەلام عەلی سەرۆکی شارەوانی کەلار**
- **سالارمەحمود سەرنوسەری گۆڤاری هەشتاوهەشت**
- **نوسینگەی بەدرخان تایمز.**
- **لەتیف فاتح فەرەج سەرنوسەری هەفتەنامەی روناکبیری کەرکوك**
- **برای وەرگێڕ جەبار عومەر**
- **دایکی لاس**
- **چونکە ئەگەر خەمخۆری ئەوان نەبوایە ئەم ژمارەیەی ئەنفالستان دەرنەدەچوو.**

## پۆزش

داوای لێبوردنێکی زۆر لەهەموو ئەونوسەرە بەرێزانە دەکەم کە بڕیاربوو ژمارەی ڕابووردوو پاداشت لەبەرانبەر نوسین‌ورێپۆرتاژوبابەتەکانیان وەربگرن, من دڵنیایان دەکەمەوە کە پاش هەوڵ‌و ماندووبوونێکی لەرادەبەدەروپاش ڕەزامەندی بەرێز وەزیری رۆشنبیری, دەیانجار چوومە بەشی ژمێریاری‌و هەرجارەی بەبیانوویەك‌و هەرجارەی بەداواکارییەکەوە, پاداشتی نوسەرانیان بەهەند نەگرت‌و تا سەرئەنجام پەیوەندیم بەهەندێك لە نوسەرەبەرێزەکانەوە کردو ئەوانیش پێیان ڕاگەیاندم کەچیدی خۆم هیلاك نەکەم, چونکە ئێمە بۆ پاداشت نەمان نووسیوە, لێرەوە زۆر بەڕاشکاوی دەیڵێم : بەداخەوە کەرنەڤاڵی ساڵی ڕابووردوو لەسەر شەقام‌و لەشاشەی تەلەفزیونەکانەوە چەندە جوانبوو, لەناوەوە هێندە وێرانبوو, ئەنفالستان بەشێکی زیندووبوو لەوکەرنەڤاڵەو بۆهەتاهەتایە لەکتێبخانەکان‌و زاکیرەی تاوانباران‌و کەس‌وکاری قوربانیەکانیشدا دەمێنێتەوە, کەچی بەوحاڵەشەوە نەك هەر زەرەری خۆمیان نەبژاردەوە کە لەوماوەیەدا 3جاربەقورسی توشی‌کارەساتی ئۆتومبیل هاتم لەپێناوی سەرخستنی ئەنفالستاندا, بەڵکو ئێستاشی لەگەڵ بێت هەندێك خەرجی گیرفانی خۆشم تیدا چوو. لەکاتێکدا بەپێش چاوی خۆمەوە 3 جار جەنابی وەزیر بەتەلەفۆن ژمیاری ڕاسپاردکە خەرجیەکانی ئەنفالستان‌و پاداشتی نوسەرەکانی جێبەجێ بکەن. بەڵام نەخۆم‌ونەنوسەرەبەرێزەکانیشی چاومان بە تاکە 50دیناریيەکی سوری چاپی نوێ نەکەوت!!



شانۆیی ( داستانێ لەئەنفال )

**خاوەن ئیمتیازو سەرنوسەر**
عومەر محەمەد
Email: omer_m0287@yahoo.com

**نەخشەسازیو جیاکردنەوەی ڕەنگەکان**
نوسینگەی بەدرخان تایمز
07701580638

**چاپخانە**
ڕەنج -

**تیراژ**
2000

# کیمیابارانی گۆپتەپە پەڵەیەکی ڕەشە بەتەوێڵی شۆڤێنیزمی عەرەبیو سەرمایەدارانی جیهانی کۆنو نوێوە

3/5/1988/ ڕۆژێکی تری یادەوەریی ترسناکە لەمێژووی گەلی کورددا, ئەوەی لەو ڕۆژەو ڕۆژانی دواتر بەگوندی گۆپتەپەوعەسکەرو سەرجەم گوندەکانی ترکرا, مەرگەساتێك بوو بیۆێنە, کیمیابارانکردنی گۆپتەپەش هێرشێك بوولەئۆپەراسیونە بەدناوەکانی ئەنفالی چوار, ڕۆژێك دوای کیمیابارنکردنی گۆپتەپە بە سەرکردایەتی گەورە تاوانباری سوپای عێراق نزارکریم خەزرەجی بە پێش لەشکری جاشەکان هێرش کرایە سەر ناوچەکەوخەڵکەکەیان بەدەردی ناوچەکانی تری گەرمیان برد, ئەو عەسرەی گۆپتەپە کیمیابارانکرا,سروشتی ناوچەکە لەوپەڕی جوانی خۆیدابوو,بەهارەکەی تەڕوبڕبوو, گەنم‌وگولینکە سورەی نیسان پێکەوە سەمایان دەکردوسروشتیان دەڕازاندەوە کچانی گوند بەلەنجەوە دەچوونەسەرکانیو کێبەرکێی جوانیان لەگەڵ جوانی بەهاردادەکرد, تەنەکە ئاوەکانی سەرشانیان لەدورەوە بریسکەیان لەخۆر دەسەندەوەو ئاوێزانی چاوی کوڕانی گوند دەبوو, لەوەها وەرزێکی بەهاردا لەشکری ئەنفالچی بەپشتیوانی دەیان هەزار سەربازوجاش‌وکەرەستەی جەنگی بە ترسناکترین شێوە پەلاماری گوند نشینەکانیاندا, بەداخەوە هەندێك لەبەرپرسەکانی ئەوسای هێزی پێشمەرگەش ڕیگربوون لەبەردەم ڕزگاربوونی ئەوگوندنشینانەی کە هەستیان بەمەترسی کردبوو, دەیانەویست لەوهەڵمەتە دڕندانەی بەعس خۆیان ڕزگاربکەن, بەلام بڕیارێکی واهەڵە نەك سیاسەتی ڕژێمی پوچەڵ نەکردەوە بەڵکو نێچیرەکانی زیاتر خستە بۆسەیەوە, پێشمەرگەی دێرین مەلاشاخی ئازایانە ئەم ڕاستیە باس دەکات, ئەمە ئەگەر هەڵەیەکی‌بەرپرسەکانی هێزی پێشمەرگە بوویێت لەوناوچەیەدا ئەوا هەموو دنیای سەرمایەداری لە کۆمەڵکوژی کورددا تاوانبارن, بەعس بەسیاسەتی خۆی بەلام بەچەکی ئەمریکیوروسیو چەکی‌کیمیایی کۆمپانیاکانی ئەلمانی قەتل‌وعامی شاری هەڵەبجەو گۆپتەوگوندەکانی تری پێکرد, هەربۆیە کورد بەبێدەنگیو دیزە بەدەرخۆنەکردنی ئەو تاوانە هیچ ناچنێتەوە, بەڵکو ئەرکی سەرشانی هەموولایەکمانە ئەو تاوانانە دیکۆمێنت بکەینوڕێکخراوەنێو دەوڵەتیەکانی پێوە سەرقاڵبکەینو بیکەینە کێشەیەکی میللیو ئایندەی سیاسیمانی لەسەر بنیات بنێین .


تابلۆیەك لە شانۆیی سرودەکانی تابووت

## خەزرەجی

# ئەو تاوانبارەی گۆپتەپەی قەتلو عام کردو سەرانی کورد داکۆکیان لێکرد!!

گەورە ئەفسەری تاوانباری شالاوەکانی ئەنفال وباعسی کوشتنو ئازاردان وبێ سەروشوێنکردنی هەزاران مرۆڤی کورد, ئەو تاوانبارەی پاش ئەوەی سەرپەرشتی چەندین پلانی قەتڵ و عامی کردوەوپێشەوای سوپای عێراقی بوولەسەروەختی ئەنفال کردنی کورددا بەتایبەتی لەدەوروبەری عەسکەروگۆپتەپەودەشتی کۆیە, وك گەورەترین خوێن ڕێژی کوردەکانی ئەو ناوچەیە دەرکەوت, ئەگەرچی هەتا ئێستا چەندین دیکۆمێنتوبەڵگەنامەی ئاشکرا ئەوڕاستییەیان ساغ کردووەتەوە, کەخەزرەجی شایانی گرتن‌وداد‌گایی‌کردنەوهەقی سزادانی هەیە, بەتایبەتی لەپاش ڕوخانی ڕژێمی بەغداوڕیسوابوونی ئەوسوپایەی کەئەوسەرۆك ئەرکانی بوو, ئیدی ئەمرۆ ئێمەی کورد, مافی خۆمانە جارێکی تر کەیسی دادگایی کردنەکەی بخەینەوە بەرچاوی دادگای دانیمارك‌ولەوێشەوە بۆ دادگای نێو دەوڵەتی, بەپێچەوانەوە




کاتێك دەبینین وەهاتاوانبارێك کەبەهەموبەڵگەیەك دەیسەلێنین جێبەجێکەری سیاسەتی پاکتاوکردنی کوردبووە, بەتایبەتی لەسالانی 183-1988 مرۆڤ نائومێد دەبێت بەرامبەر بەیاساوپڕوپاگەندەکانی دیموکراسیوبەندەکانی جارنامەی گەردوونی مافی مرۆڤ , خەزرەجی لەپێناوی بەرژەوندی تایبەتی خۆیدا لە چنگ سەدامو ڕژێمەکەی ڕایکرد بۆیە هەقنیە ئەمرۆ لەبەرگی ئۆپۆزسیۆندا خۆی مەلاس بداو شەرەفی ئەنتی سەدامو ڕژێمەکەی وەربگرێ, چونکە ئەولەواقعدا ئۆپۆزسیۆنی سەدام نەبوو, بەڵکو توخمێك بوو کت‌ومت لەخۆی, بەلام هێندە هەیە ڕەنگە لەوێزەی گەورە دیکتاتۆر نەهاتبێ‌و لەوەدا بەختی دەربازبوونی بۆ ڕەخساوە(ئەمە ئەگەر ڕێکەوتنی نیوان خۆیو سەدامیش نەبوبێت بۆ جێبەجێکردنی پیلانێکی شاراوەی بەعس) دواجار بەپێچەوانەوە خەزرەجی تاوانکارێکی ئاشکراو دڕندەیەکی ناو سوپای بەعس‌و لەمدواییانەشدا سەرەك ئەرکانی جەیش بووەو بەرپرسیارە بەرامبەر هەموو ئەو پێشێلکاریانەی لە کوردستاندا ئەنجامدراوون, بەتایبەتی هەردوو شالاوی بەعسیانە کە بەچەکی کیمیاییو بایەلۆژی لە هەڵەبجەو ئەنفالەکاندا ئەنجامدران‌ونزیکەی 10 هەزار کەسیان لەو شارەو شێخ وەسانانو بالیسانو چەند ناوچەیەکی تریش کوشتووە بێجگە لە کوشتنو بێسەروشوێنکردنی نزیکەی 200000 مرۆڤی کورد.




## دیکتاتۆرەکانی جیهان هەرچەندە بەزەبرو زەنگبن چارەنوستان لە ئەبو عودەی باشتر نابێت

# خەمەکانی ئەنفالستان

هەرلەدوای دەرچوونی ژمارەیەکەوە سەردانی بەڕێز وەزیری ڕۆشنبیریم کرد بەونیازەی بۆساڵی ئایندە پلانێکی نویٚ بۆ دەرچوونی ژمارە(2) دابنێین‌و سەرنوسەرودەستەی نوسەرانی بۆدیاری بکەین‌و داهاتووبەبەرنامەیەکی ڕێك‌و پێکتر دەربچێت, ئەگەرچی بەڕێز وەزیری ڕۆشنبیری پێشنیارەکەمی پەسەندکرد. بەلام بەرواری 2005/2/15, بەنوسراوی ڕەسمی بیرخەرەوەیەکم پێشکەش کردو لەنوسینگەی تایبەتی خۆی دامناو چەند ڕۆژێك چاوەڕوانی وەڵام بووم, بەلام وەڵامی نەبوو, دواجار لەچاوپێکەوتنێکی ڕیکەوتدا بەدەمی پێی ڕاگەیاندم کە ئەنفالستان دەرناکەین, ئەگەرچی ئەوهەواڵە بۆمن زۆر ناخۆش بوو, بەڵام بڕیارمدا ئەگەر لەسەر قووتی خۆشم بێت نابێت هەناسەی ( ئەنفالستان) تەنها ژمارەیەك بێت, سەرباری درەنگ وەختی بەتەنها قۆڵم لێهەڵماڵییەوە, کاك جبار عومەر ئامادەیی خۆی دەربڕی‌و ووتی من هاوکاریت دەکەم‌وهەوڵدەدەین, بەهەموولایەك فشاری مادی لەسەر تۆکەم بکەینەوەوخۆشم لەڕووی وەرگێڕانیعەرەبییەوە درێغی ناکەم. دواتریش برای بەڕێزم کاك سەلام عەلی سەرۆکی شارەوانی کەلاروکاك سالار مەحمودی سەرنووسەریگۆڤاری هەشتاوهەشت‌و برای نوسەر کاك لەتیف فاتح فەرەج ئامادەی پشتگیریکردنم بوون‌ولەراستیشدا درێغییان نەکرد.